# چۆن دەبیتە کەسێکی موەحید

ئامادەکردنی : دابان تەوحیدی

دیزاین : محمد عبدالرحمن

## ﴿پێشـــــەکی﴾

الحمد لله ، والصلاة والسلام على رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ، وأشهد أن لا إله إلا الله ، وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله ( صلى الله عليه وسلم )، أما بعد:

خوشک و برای موسلمانم چاک بزانە کەوا هەر پێغەمبەرێک ڕەوانە کرابێت بۆ گەلەکەی لە پێش هەموو شتێکەوە بانگەوازی گەلەکەی خۆیانیان کردووە بەوەی کە تەنها الله بپەرستن و دوور بکەونەوە لە هەموو جۆرە پەرستراوێک و شیرکێک وە ئەمەش بانگەوازی تاکە بە تاکەی پێغەمبەران بووە (سەلامی الله لە هەموویان بێت)، هەروەک چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ } واتە : سوێند بە خـودا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت : تەنها خـودا بپەرستن ، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر ، جا هەبوو لەو خەڵکە ( کە بیرو هۆش و ژیری خۆی خستەکار و بە شوێن ڕاستیدا دەگەڕا ) خـودایش هیدایەتی دەدا ، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکرد و بەسەریدا دەچەسپا ، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویدا و سەرنج بدەن ، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو . [ سورەتی النحل : 36 ـ تەفسیری ئاسان ]

بۆیە چاک بزانە کە واجبە بترسی و داوا لە الله بکەیت کە بتپارێزێت لە شیرک و هاوبەش بڕیاردان ، هەروەک چۆن پێغەمبەر ئیبراهیم ( سەلامی الله لێی بێت ) دەپاڕایەوە {وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ}

واتە : ( بەیاد بێنە ) کاتێك ئیبراهیم نزای کرد و وتی : پەروەردگارا ، باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شار و وڵاتەدا و خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرەستین [ سورەتی إبراهیم : 35 ـ تەفسیری ئاسان ]

بۆیە ئەی خوشک و برای موسلمانم چاک بزانە کەوا هەر پێغەمبەرێک الله تعالی ڕەوانەی کردبێت و بانگەوازی گەلەکەی کردبێت بۆ تەوحید و بۆ بە تەنها پەرستنی الله و دژایەتی کردنی طاغوتەکان ، ئەوا بە لایەنی کەمەوە گاڵتە و سوکایەتی زۆری پێ کراوە یان ئەشکەنجە دراوە یاخود گیانی خۆی لەم ڕێگایە سپاردووە ، بۆیە کاتێک وەک خۆی شوێنی پێغەمبەران کەوتیت ئاوا ئازار و ناڕەحەتی زۆرت دێتە ڕێگات و دەبێت ئارام بگریت، هەروەک چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ } واتە : هەر نا بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێک لەپێش ئەماندا نەهاتووە ، خـودانەناسان نەیانوتبێت جادووگەرە ، یان شێتە [ سورەتی الذاريات : 52 ــ تەفسیری ئاسان ].

وە هەروەها الله تعالی لە کتێبە پیرۆزەکەی دەفەرموێت : {قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ * قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ } واتە : هەندێ ( لە بت پەرستان) وتیان ( ئیبراهیم ) چاك بسوتێنن و یارمەتی خـوداکانتان ( بتەکانتان )

بدەن ئەگەر ئێوە ئەو کارە دەکەن * کە ( ئیبراهیمیان خستە ئاگرەوە ) وتمان ئەی ئاگر سارد بەرەوە و بێ زیان بە بۆ ئیبراهیم [سورەتی الأنبیاء : 68 _ 69 ـ تەفسیری پوختە]

وە ئایە دەزانیت پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) چۆن ترسێنراوە و ئەشکەنجە دراوە لەسەر ئەم بانگەوازە ؟ بزانە پێغەمبەر گیان ( صلی الله علیه وسلم ) چی بەسەر هاتووە ..!

ئەنەس ( الله لێی ڕازی بێ ) فەرموویەتی : جارێک لە نێردراوی خودا ( صلی الله علیه وسلم ) یان دا هەتا لە خۆچوو [رواه الحاکم].

* سەبارەت بە خۆی فەرموویەتی : بێگومان ئازار دراوم لە پێناو خودا کەس بەم جۆرە ئازار نەدراوە ، ترسێنراوم لە پێناو خودا بە جۆرێک کەس بەم شێوەیە نەترسێنراوە [رواه أحمد].

▪ بۆیە ئەی خوشک و برای موسلمانم ئەوەش چاک بزانە کە هیچ کەسێک لە قیامەت ڕزگاری نەبێت تاوەکو لە هەموو جۆرە شیرکەکان خۆی نەپارێزێت ، چونکە الله تعالی دەفەرموێت : {إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ} واتە : دڵنیابن ئەوەی شەریک و هاوبەش بۆ خودا بڕیار بدات ، ئەوە بێگومان خودا بەهەشتی لەسەر حەرام کردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە ، ئەوسا ئەو ستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نییە ( کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت ) [ سورەتی المائدة : 72 ـ تەفسیری ئاسان ].

تێبینیەک // زۆر جار دەوترێت بۆچی پێشتر لە هاوەڵان یان ئەوانەی دوای هاوەڵانەوە بەخۆیان نەگوتووە ( موەحید ) ئایە ئەمە بیدعەیە یان بۆچی ؟

لە وەڵام ئەڵێین : بێگومان الله تعالى ناوی موسلمانی لێمان ناوە ، وەک دەفەرموێت :

{هو سماكم المسلمين من قبل وفي هذا} واتە : لە پێشدا و لەم قورئانەشدا هەر خـودا ئێوەی ناوناوە موسڵمان و خۆبەدەسەوەدەر [سورەتی الحج : 78 ــ تەفسیری ڕامان].

- لێرەدا وەکو ناو تەنها ناوی موسلمان لە خۆمان ئەنێین ، بەڵام الله تعالى وەصفی ئیبراهیم ـی کردووە بەوەی کە ئەو حەنیف بووە ، ( حنيف ) واتە : لادان لە هەموو جۆرە شیرکێک بە مەبەستی چوون بەرەو تەوحید و یەک خـودا پەرستی.

هەروەک الله تعالى لە وەصفی پێغەمبەر ئیبڕاهیم ( سەلامی خـودای لێ بێت ) دەفەرموێت : {ماكان إبراهيم يهوديا ولا نصرانيا } واتە : دڵنیابن کە ئیبراهیم نە جوولەکە بوو و نە گاور، { ولكن كان حنيفا مسلما وما كان من المشركين } بەڵکو خـودا بە یەکزان و یەکخـوداپەرست و ملکەچ و ڕاساڵ و موسڵمانێك بوو ، تەنها ساتێکیش لە هاوبەش پەیداکەران نەبوو [سورەتی آل عمران : 67 ـ تەفسیری ڕامان]

بۆیە ئەی خوشک و برای موسلمانم چاک بزانە ئێستا لە عەلمانیەک بپرسیت خۆی پێ موسلمانە وە لە ڕافیزەیەک بپرسیت خۆی پێ موسلمانە یان لە هەموو جۆرە تاقم و فیرقە گومڕاکان هەر هەمان وەڵام ئەدەنەوە ، بۆیە هەموو موەحیدێک موسلمانە بەڵام هەموو بەناو موسلمانێک موەحید نییە ، بۆیە ئەوان تەنها بە تەسکەلە و بەناو موسلمانن ، لەبەر ئەوەی خۆیان دوورە پەرێز نەکردووە لە طاغوت و لە کوفر و شیرک،

بۆیە ئێمەش وەکو وەصفێک بەخۆمان ئەڵێین موەحید وەکو جیاوازیەک لەگەڵ ئەوان، ئینجا کاتێک گروپە گومڕاکان پەیدا بوون وەک خەواریج و مورجیئە و ڕافیزە و جەهمی و موعتەزیلە ...هتد

ئەوا زانایان لە هاوەڵان و تابعین هەستان زاراوەی ( أهل السنة )ـیان بەکارهێنا بۆ جیاکردنەوەی ئەهلی هەق لەگەڵ ئەهلی بیدەع ، چونکە ئەوانیش بەخۆیان دەگوت موسڵمان ، بەڵگەش لەسەر ئەوە :

عبد الله بن عباس ( رضي الله عنه ) لە تەفسیری ئایەتی {یوم تبیض وجوه وتسود وجوه} [ آل عمران : 106 ]

فەرمویەتی : (حین تبیض وجوه أهل السنة والجماعة ، وتسود وجوه أهل البدعة والفرقة) [ تفسیر ابن کثیر ] واتە : ڕووی ئەهلی سوننە و جەماعە سپی دەبێت لەو ڕۆژەدا ، وە ڕووی ئەهلی بیدعە و فرقە ڕەش دەبێت.

بۆیە إن شاء الله لە وانەکانی داهاتوو بە ووردی بیخوێنەوە و بە درێژی إن شاء الله باس لە تەوحید و کوفر و شیرک و کوفر بە طاغوت ئەکەین .

- ئەم کتێبە لە سێ " الفصل " وەرز پێکهاتووە لەگەڵ " الختامة " کۆتایی ، وە کتێبەکە بەناوی ( کیف تکون موحداً ) واتە : چۆن دەبیتە موەحـــید ، لە نوسینی " الشیخ حسن عمر " .

**نوسینی پێشەکی و وەرگێڕانی // دابان تەوحیدی ( عەقیدەی موەحیدان ).**

## ∮وانـــــەی یـەکـەم ①∮

### [ " الفصل " وەرزی یـەکەم ]

**بـەشی یەکەم : بە تاک دانانی خـودای تعالی لە درووشمەکانی و قوربانی کردن ...**

---

**لە ڕاستیدا هیچ گومانێکی تێدا نییە کەوا ئێمە لە سەردەمی غوربەت و نامۆیەتی ئیسلام داین ، هەروەک چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی: ( بَدَأَ الإسلام غَرِيبًا ، وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا ، فَطُوبىَ لِلْغُرَبَاءِ ) .**

**واتە : ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد و لە داهاتوویەکی نزیکیش غەریب و نامۆ دەبێتەوە هەروەکو چۆن بە غەریبی دەستی پێ کرد ، جا سەرفرازی و خۆشحاڵی بۆ نامۆکان .**

**وفي رواية : قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ ، وَمَا الْغُرَبَاءُ ؟ قَالَ : (الَّذِينَ يُصْلِحُونَ عِنْدَ فَسَادِ النَّاسِ)**

**وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە : گوتیان : ئەی پێغەمبەری خـودا، غەریبەکان کێن؟ فەرمووی: (کەسانێکی چاکن و چاکەکاری دەکەن لەکاتێکدا کە خەڵکی خراپەکاری دەکەن ) .**

وفي رواية : ( الَّذِينَ يُصْلِحُونَ مَا أَفْسَدَ النَّاسُ ) وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە : کە فەرمووی: (ئەوانەن کە ئەوەی خەڵک خراپی کردووە ئەوان چاکی دەکەن).

جا چۆن نامۆیەتی ئیسلام سەری هەڵداوەتەوە ؟

غوربەت و نامۆیەتی ئیسلام بەهۆی ئەو دەرئەنجامانە سەری هەڵداوەتەوە :

① پشت لێ کردنی زۆرێک لە خەڵکی لە فێربوون و خۆشارەزا کردن لە دینی خـودای سبحانە وتعالی .

② خۆ سەرقاڵ کردن بە شەهەوات و هەواو ئارەزووەکان .

③ کەوتن و شکست هێنان لە بەرامبەر دوژمنانی دینی الله تعالی وە دوژمنانی دین دەکەنە نمونەیەک و شوێنی دەکەون .

وە جگە لەو هۆکارانەش هۆکاری تر زۆرن ، هەتا بەم هۆکارانە غوربەت و نامۆیەتی بۆ ئیسلام گەڕاوەتەوە .

هەروەک ئیمامی عەلی ( خـودا لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت: {يأتي على الناس زمان لا يبقى من الإسلام إلا اسمه ، ولا من القرآن إلا رسمه}.

واتە : سەردەمێک دادێت بەسەر خەڵکیدا هیچ لە ئیسلام بوونی نامینێت تەنها ناوەکەی نەبێت ، وە هیچ لە قورئانەکەی خـودا نامینێت تەنها وێنەکەی نەبێت .

بۆیە مرۆڤی وا دەبینیت کە دەژی و دەمرێت بەڵام هیچ شتێک لەسەر حەقیقەتی ئیسلام نازانێت ، وە هیچ شتێک لە حوکمەکانی قورئان نازانێت .

وە لە گەورەترینی هۆکارەکان کە خەڵکی پێی تووشی ناحەق و باطل ـی دەبێت بریتییە لە : نەناسینی خەڵکی بۆ جاهیلیەت !

هەروەکو ئیمامی عومەر ( خـودا لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت : {تنقض عری الإسلام عروة عروة إذا نشأ في الإسلام من لا يعرف الجاهلية}.

واتە : پەت و گوریسەکانی ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە پەت لە دوای پەت ، جا ئەگەر کەسێک لەنێو ئیسلامەتیدا گەورە ببوو و پێگەیشت بوو ئەوا هیچ لە جاهیلیەت نازانێت .

جا ئەگەر ئەوەمان زانی ئەوا واجبە لەسەرمان کە بزانین ئەو تەوحیدەی کە الله تعالی دەیەوێت چییە کە لە نێو کتێبەکەی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیە وسلم ) باسی لێوە کراوە؟

لەگەڵمان بە بەیارمەتی الله ڕوونی دەکەینەوە کەوا هەموو ئەوەی لە ئەهلی جاهیلیەتی یەکەم تێیدا ڕووی داوە ئەوە جارێکی تر بە هەمان مانا و ناوەڕۆکی گەڕاوەتەوە ، بەڵام بە شکل و شێوەیەکی زۆر خراپتر و پیستر .

وە ئەوەش لە دەرئەنجامی ناولێنانی ناوەکان بە غەیری ناوە حەقیقەت و ڕاستەقینەکەی خۆی .

بـۆیە کاتێک خەڵکی لەبەر قەبر دەپاڕێنەوە و گۆڕ دەپەرستن ناویان لێ ناوە ( توسل و شفاعة ) پاڕانەوە و داوا لێ کردن وە تکا بۆ کردن .

وە (التشریع) یاسا دانان لە شوێنی الله تعالی ناویان لێ ناوە دیموکراسی و بڕیاری پەڕلەمانی .

(موالاة الکفار) دۆستایەتی کردن کافران ناویان لێ ناوە یەکگرتوویی نیشتیمانی.

وە ڕێگەدان بە کوفرەکانیان ناویان لێ ناوە یەکبوونی برایەتی ئینسانی.

ئینجا لێرە شێواندنی حوکمەکان لە ئەنجامی تێکەڵ کردنی ناوە حەقیقەتەکەیە لەسەر خەڵکی هەروەک ڕوونی دەکەینەوە بە یارمەتی خـودا .

## ﴿وانـــــەی دووەم ②﴾

یەکەم : پێویستە کـە گرنگیەتی بەدەست هێنانی تەوحید بزانین :

① تەوحید ( یەک خـودا پەرستی ) هۆکارێکە بۆ چوونە نێو بەهەشت :

هەروەک لە فەرموودەدا هاتووە :

(عن جَابِرٍ ، قَالَ : أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ ، مَا الْمُوجِبَتَانِ ؟ فَقَالَ : ( مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللهِ شيئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللهِ شيئًا دَخَلَ النَّارَ).

واتە : لە جابر ـەوە ، دەڵێت : پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) پێی گووت : ئەی پێغەمبەری خـودا ، ئەو دوو سیفەتەی مرۆڤ شایانی بەهەشت و دۆزەخ دەکەن چین ؟ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( هەرکەسێک مرد و هیچ شتێکی نەکردبێ بە هاوەڵ بۆ خـودا دەچێتە بەهەشت ، وە هەرکەسێکیش مرد و شتێکی کردبێ بە هاوەڵ بۆ خـودا دەچێتە دۆزەخەوە ) .

وە هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : ( لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلا نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ )، واتە : ( تەنها مرۆڤی باوەڕدار دەچێتە بەهەشتەوە ).

② مرۆڤی هاوبەش دانەر و موشریک بە هیچ جۆرێک ناچێتە بەهەشتەوە:

هەروەک الله تعالى دەفەرمویت : {إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ}.

واتە : بەڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆ خـودا دابنێ ئەوە بێگومان خـودا بەهەشتی لێ حەرام کردووە ، وە جێ و شوێنی ئاگر دەبێت وە بۆ ئەو ستەم کارانە هیچ یارمەتی دەرێك نییە. [ سورەتی المائدة : 72 ــ تەفسیری پوختە ]

بۆیە هەرکەسێک لەسەر شیرک مردبێ ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە ، وە هەموو موەحید و یەک خـودا پەرستێک بەهۆی یەکخـودا پەرستیەکەی دەچێتە بەهەشتەوە .

③ هەروەها واجبە لەسەرمان کەوا بزانین هیچ کردەوەیەک لە کردەوە چاکەکان قبوڵ نابێت تەنها دوای ئیمان هێنان بە الله تعالى نەبێت وە بە تەنها پەرستنی الله تعالى ، وە بە تاک دانانی خـودای سبحانە وتعالى لە عیبادەت و بەندایەتی بۆ کردنی .

هەروەک لە فەرموودەی موعاز هاتووە.

كما في حديث معاذ بن جبل ( رضي الله عنه ) عندما بعثه رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) إلى اليمن فقال له : ( إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أهل كِتَابٍ ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إليه عِبَادَةُ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ )

- وفي رواية : أَنْ يُوَحِدُوا الله ،

- وفي رواية : أن يَشْهَدُوا أن لا إله إلا الله وأن مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، فإن هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ ، فَأَعْلِمْهُمْ أن اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ، فإن هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أن اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ ، وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ.

واتە : کاتێک پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیە وسلم ) موعازی کوڕی جەبەل ـی نارد بۆ یەمەن ( خـودا لێی ڕازی بێت ) پێی فەرموو : (تۆ ئەچیت بۆ لای گەلێك کە خاوەنی کتێبن ، با یەکەم کارێکت بانگهێشت کردنیان بێت بۆ بەندایەتی و عیبادەتی خـودای عز وجل)

- وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە : خـودا بە تاک و تەنهایی بناسن و بیپەرستن .

- وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە : شاهێدی بدەن کە هیچ خـودایەک شایەنی پەرستن نییە تەنها الله نەبێت وە محمدیش نێردراوی خـودایە ، جا ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵیان کردی ، پێیان بڵێ و ئاگاداریان بکە کە خـودا لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون و ئەبێت پێی هەڵسن ، وە ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵیان کردیت ، ئەوا ئاگاداریان بکە کە خـودا خێر و چاکەی لەسەر داناوون بە شێوەیەک کە لە دەوڵەمەند و خاوەن سامانەکانیان ئەسەنرێت و ئەدرێت بە هەژار و نەبوو و دەست کورتەکانیان .

جا لێرەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە سەرەتادا فەرمانی نەکرد بەوەی کە یەکەم جار پێیان ڕابگەیەنێت کە نوێژ بکەن و زەکات بدەن ، مەگەر دوای ئەوەی کە تەوحیدیان قبـوڵ کرد ، ئەویش (بە تاک دانانی خـودایە لە بەندایەتی و عیبادەت بۆ کردنی)

هەروەک پێی فەرموو : ( أَنْ يُوَحِدُوا الله ) واتە : خـودا بە تاک و تەنهایی بناسن و بیپەرستن .

وە هەروەها إجماعی زانایانی لەسەرە کە کردەوەی چاکە قبوڵ نابێت تەنها دوای ئیمان هێنان نەبێت ، وە لەبەر ئەوە موسڵمان بوون مەرجە بۆ قبوڵ بوونی کردەوەی چاکە .

④ شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ خـودا هەموو کردەوە چاکەکان هەڵدەوەشێنێتەوە :

هەروەک چۆن الله تعالى بە چاکترینی درووست کراوەکان پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : {وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ}.

واتە : سوێند بە خـودا نیگا کراوە بۆ تۆ وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش ، ئەگەر هاوبەش بۆ خـودا دابنێی بەڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە وە بێگومان لە زەرەرمەندان دەبیت . [ سورەتی الزمر : 65 ــ تەفسیری پوختە ]

جا الله تعالی هەواڵی بە پێغەمبەرەکەی داوە ( صلی الله علیه وسلم ) کەوا وەحی و نیگای بۆ کراوە وە بۆ هەموو پێغەمبەرەکانی پێشە خۆی کە هەریەکێکیان شیرک و هاوبەش دابنێت بۆ خـودا هەموو کردەوە چاکەکانی هەڵدەوەشێتەوە ، وە هیچ شتێک سوودی پێ ناگەیەنێت بەڵکو لە زەرەرمەندانیش دەبێت .

وە هەروەها الله تعالی دوای ئەوەی کە باسی هەژدە پێغەمبەر دەکات کە ئەوانیش: (إبراهیم ، و إسحاق ، و یعقوب ، و نوح ، و داود ، و سلیمان ، و أیوب ، و یوسف ، و موسی ، و هارون ، و زکریا ، و یحیی ، و عیسی ، و إلیاس ، و إسماعیل ، و الیسع ، و یونس ، و لوط).

ئینجا دوای ئەوەی کە الله سبحانه وتعالی باسیانی کرد جا دەفەرموێت: {ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ}

واتە : ئەوەیە رێی ڕاستی خـودا و رێنمایش هەر بەدەستی خۆیەتی لە بەندەکانی خۆی کێ حەزلێ بکا، شارەزا و ڕێنمایی گشت کارێکی خێری دەکات، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر ئەو پەیامبەرانە ( علیهم السلام ) هاوبەشیان بۆ خـودا دانابا هەموو کارەکانیان سەرجەم پووچەڵ دەبوویەوە . [سورەتی الأنعام : 88 ــ تەفسیری ڕامان]

جا لێرەدا الله تعالی دووپاتی کردۆتەوە کە ئەگەر هەریەکیک شیرکی بۆ خـودا بڕیاردا ، ئەگەر هاتوو لە چاکترینی پێغەمبەرانیش بێت ( سەلامی خـودایان لێ بێت ) ئەوا هەموو کردەوە چاکەکانی هەڵدەوەشێتەوە و سوودی بۆی نابێت.

{وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ}

ولذا فإن عائشة رضي الله عنها لما ذكرت لرسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) عبد الله بن جدعان فقالت : يا رسول الله ؛ أرأيت عبد الله بن جدعان فإنه كان يقري الضيف (أي: يكرمه)، ويطعم المسكين ، ويصل الرحم ، فهل نافعه من ذلك شيءٌ ؟ فقال : « لَا يَا عَائِشَةُ ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا : رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ »

واته : بۆیه کاتێک عائیشه ( خـودا لێ ڕازی بێت ) باسی عبد الله ـی کوڕی جدعان بۆ پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەکات و دەفەرموێت : ئەی پێغەمبەری خـودا ، ئایا عبدالله ـی کوڕی جدعان ـت نەبینیوە کە زۆر ڕێز لە میوان دەگرێت وە خـواردن بە هەژاران دەبەخشێت و سەردانی خزمان و ناسیاوانی دەکات ، جا ئایا هیچ شتێک لەوانە سوودی بۆی هەیە؟

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی: ئەی عائیشە نا نەخێر ، لەبەرئەوەی ئەو پیاوە هیچ ڕۆژێک نەیگوتووە: پەروەردگارا لە هەڵە و تاوانەکانم خۆشببە لە ڕۆژی قیامەت و لە ڕۆژی پاداشت و سزا .

کەواتە بە کورتی: شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله هەموو کردەوەیەکی چاکە هەڵدەوەشێنێتەوە.

## ∮وانـــــەی سێـیەم ③∮

⑤ هـەر لەو بابەتە گرنگەی کە باسی لەبارەیەوە دەکەین ئەویش بریتییە لەوەی کە بزانین تەوحید حەق و مافی خـودای گەورەیە ، مادام ئەوەش جێگیر بووە کە حەقی الله تعالی ئەوەیە کەوا بە تاک و تەنهای بزانین ، ئەوا پێویستە بەندەکەی حەق و مافی خـۆی پێبدات لە ئاست خـودای سبحانە وتعالی .

جا هەرکەسێک ئەو حەق و مافەی بەجێ گەیاند ئەوا دەچێتە بەهەشت ، وە هەرکەسێکیش ئەو حەقەی بەجێ نەگەیاند دەچێتە دۆزەخەوە ، وە ئەو حەقەش کە تەنها مافی خـودایە ئەوا خـودای عز وجل ڕوونی دەکاتەوە و دەفەرموێت:

{مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ * وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ}

واتە: بۆ هیچ ئادەمیزاد و کەسێک نەگونجاوە کە خـودا کتێبی ئاسمانی و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەرایەتی پێ ببەخشێت، لەوەودوا بە خەڵکی بڵێت: وەرن ببنە عەبد و بەندەی من لە جیاتی ئەوەی بەندە و عەبدی خـودا بن، بەڵکو (بە خەڵکیان وتووە) هەوڵ بدەن بۆ خـودا بژین و لێبڕاو بن، بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار هەوڵ بدەن، بەوەش دەبنە خـوداناس و ڕەبانی کە بەرنامەی خـودا فێری خەڵکی بکەن و خۆشتان بەردەوام هەوڵ بدەن فێری ببن * (هیچ پێغەمبەرێک) فەرمانی ئەوەی نەداوە کە فریشتەکان و

پێغەمبەران بکەن بە پەروەردگار ( هەرگیز کاری لەو جۆرە لەوان ناوەشێتەوە ) ئایا ڕاستە فەرمانی بێ باوەڕی و کوفرتان پێ بدات دوای ئەوەی کە ئێوە موسڵمانن و ملکەچی پەروەردگارن ؟! . [ سورەتی آل عمران : 79 , 80 ــ تەفسیری ئاسان ]

کەواتە زانیمان هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە ئەو پێغەمبەرە ئەگەر لە بەرزترین پلە و پایەش دابوبێت بتوانێت کە وا بەخەڵکی ڕابگەیەنێت کە ئەویش حەقی عیبادەت و بەندایەتی بۆ کردنی هەیە لەگەڵ الله ، بۆیە خـودای سبحانە وتعالی قەدەغەی کردووە لەوەی مەلائیکەتەکان و پێغەمبەران بکرێنە پەروەردگار و بپەرسترێن ، لەگەڵ ئەوەی ئەوان چاکترین و بەڕێزترین درووست کراون لەلای خـودا.

جا ئەوە لە بابی ئەولایە کە درووستکراوێکی تر ئەگەر ئەو درووستکراوە لە هەر پلەو پایە و مەکانەتێک دابێت لەلای خـودا بە هیچ شێوەیەک درووست نییە کە بکرێتە شەریک و هاوبەش لە شوێنی خـودا، وە هەر تایبەتـمەندیەک لە تایبەتـمەندیەکانی خـودا نابێت بە هیچ شێوەیەک تایبەتی بکات بە هیچ درووستکراوێکی تر لەبەرئەوەی ئەوە شەریک دانانە بۆ خـودای تعالی .

بۆیە بەڕاستی الله تعالی لە کتێبە پیرۆزەکەی دەفەرموێت: {وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ من دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أن أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ * مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أن اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ}

واته : وه (بیر بکەرەوه) کاتێ خـودا دەفەرمووێ (له ڕۆژی دوایی دا) ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ وتووته به خەڵکی که من و دایکم به دوو پەرستراو دابنێن (و بمان پەرستن) له جیاتی خـودا ؟ (عیسا) وتی پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خـودایه نابێ و ناگونجێ بۆ من شتێ بڵێم که به هیچ شێوەیەك مافی من نییه ئەگەر من ئەو قسەیەم کردبێ ئەوه بەڕاستی تۆ ئاگات لێیه چونکه تۆ ئەوەی له دڵم دایه دەیزانی بەڵام من نازانم و بێ ئاگام لەو نهێنیەی که لای تۆیه بەڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی به هەموو نهێنی یەك * هیچم پێ نەوتوون بێجگه لەوه نەبێت که تۆ فەرمانت پێداوم که بەندایەتی خـودا بکەن که پەروەردگاری من و ئێوەیشه.

[سورەتی المائدة : 117,116 ــ تەفسیری پوختە]

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خـودای لێ بێت) پێغەمبەرێکی (أولي العزم) بووه لەنێو پێغەمبەران، بۆیه خـودای عز وجل ڕوونی کردۆتەوه به ڕوون کردنەوەیەکی ئاشکرا که هەرکەسێک هاوبەش بڕیار بدات بۆ خـودای سبحانه وتعالی ئەوا سنووری بەزاندووه له ئاست حەق و مافی خـودای تعالی ئەگەر ئەو کەسە لەهەر پلەو پایه و مەکانەتێک دابێت لەلای الله تعالی، لەبەرئەوەی به دڵنیاییەوه تەوحید حەق و مافی خـودای تعالی ـیه که به تاک و تەنهایی بیپەرستیت .

وه هەروەها ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە ئەوەی لە حەقی مەلائیکەتەکان وتراوە (سەلامی خـودایان لێ بێت)، کاتێک موشریکەکان لەبارەی مەلائیکەتەکانەوە دەیانگوت ئەوانە کچانی خـودان.

ئینجا الله تعالى فەرمووی : {وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ * لاَ يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ * يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ * وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِّن دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ}.

واتە : وە ( بێ باوەڕان ) وتیان خـودای میهرەبان منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە ( کە فریشتەکانن ) پاك و بێگەردە خـودا ( لەم شتانە ) بەڵکو ئەوانە ( فریشتە ) بەندەی ڕێز گیراوی خـودان * لە خـودا پێش ناکەون بە قسە و وتە وە ئەوان بە فەرمانی خـودا کار دەکەن * خـودا دەزانێ ئاگادارە بە ئەوەی لە دنیا لەبەر دەستیاندایە وە بە ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادە کراوە وە ( فریشتەکان ) تکا ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ ( خـودا ) ڕازی بێ ( تکای بۆ بکرێ ) وە ئەوان ( فریشتەکان ) لە ترس و هەیبەتی خـودا زۆر دەترسن * وە هەر کام لەوانە ( فریشتەکان ) بڵێ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لە خـودا ئەو بە ( ئاگری ) دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین هەر بەو جۆرە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە ( تۆڵەیان لێ ) دەکەینەوە.

[سورەتی الأنبياء : 26 ... 29 ــ تەفسیری پوختە]

جا لێرەدا الله تعالى ڕوونی کردۆتەوە کە فریشتەکان کچانی خـودا نین وەک ئەوەی کە موشریکەکان دەیڵێن، بەڵکو ئەوان بەندەی ڕێز گیراوی خـودان، وە هیچ شتێک ناکەن تەنها بە فەرمانی خـودا نەبێت ، تا ئەوەی کە الله تعالى دەفەرموێت: {وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِّن دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ}

واتە : وە هەر کام لەوانە (فریشتەکان) بڵێ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لە خـودا ئەو بە (ئاگری) دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین هەر بەو جۆرە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە ( تۆڵەیان لێ ) دەکەینەوە.

جا لێرەدا الله تعالى ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کەوا ــ ئەگەر هاتوو ــ فریشتەیەک لە فریشتەکان (سەلامی خـودایان لێ بێت) بڵێت منیش پەرستراوم ئەوا خـودا دەیخاتە دۆزەخەوە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەو فریشتەیە سنووری خۆی بەزاندووەتە ئاست حەقی الله تعالى .

ــ وە ئەو حەق ـەش مەبەست پێی تەوحیدە ــ کە بریتییە لە بەتاک دانانی الله تعالى لە عیبادەت و بەندایەتی بۆ کردنی.

{وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا إِلَهٌ وَاحِدٌ} واتە : خۆ جگە لە خـودای تاك و تەنیا ، هیچ پەرستراوێك بۆ پەرستن ناشێ و نییە [سورەتی المائدة : 73 ــ تەفسیری ڕامان].

⑥ تەوحید یەکەمین واجبە :

تەوحید یەکەمین واجبە لەسەر هەموو درووستکراوێک ، جا تەوحید یەکەم حەق و مافە کە دەبێت تەنها بۆ الله تعالی جێ بەجێ بکرێت:

وە ئەوەش روون کراوەتەوە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خـودا (صلی الله علیه وسلم)

في حديث معاذ ( رضي الله عنه ) حين قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) له : « يَا مُعَاذُ أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى العِبَادِ ؟»، قَالَ : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ، قَالَ : « أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ، أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ؟ »، قَالَ : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ، قَالَ : « أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»

واتە: لە فەرموودەکەی معاذ (خـودا لێی ڕازی بێت) هاتووە کاتێک پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) پێی فەرموو:

(ئەی موعاز ئایا دەزانیت حەق و مافی خـودا لەسەر بەندەکانی چییە؟ موعازیش فەرمووی: خـودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: مافی خـودا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە بە تاک و تەنهایی بیپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن وە هیچ شتێک نەکەن بە شەریک و هاوبەش بۆی ، ئینجا فەرمووی: ئەی ئایا دەزانیت حەقی بەندەکان چییە لەسەر خـودا گەر هاوبەشیان بڕیار نەدا بۆی؟ موعازیش فەرمووی : خـودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن ، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: کەواتە خـوداش سزایان نادات .

جا کەواتە ئێستا بۆت ڕوون بوویەوە کە حەقی خـودا لەسەر بەندەکانی بریتییە لە :

أ- بە تاک و تەنهایی بیپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن .

ب- وە هیچ شتێک نەکەن بە شەریک و هاوبەش بۆی .

بۆیە هەرکەسێک بەم شێوەیە ئەو کارەی کرد ئەوە بەڕاستی خـودا سزای نادات ، ئا ئەمەش بەڵگەیە بۆمان لەسەر گرنگیەتی و پلەو پایەی تەوحید لەلای الله تعالی ، بۆیە الله تعالی دەفەرموێت: {إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ}.

واتە : بەڕاستی خـودا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت ، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت ، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت.

[سورەتی النساء : 48 ـ تەفسیری ئاسان]

جا هەموو گوناهـ و تاوانێک دەکرێت بەندە بەهۆیەوە خـودا سزای بدات وە دەشکرێت کەوا خـودا لێی خـۆش بێت (واتە : لەژێر ویستی الله تعالی دایە).

بەڵام شیرک و هاوبەش بڕیاردان ( ئەگەر پێش مردنی وازی لە شیرک نەهێنابوو و بەو حاڵەوە مردبوو ) ئەوا خـودای عز وجل هەرگیز لێی خۆش نابێت .

## ∯وانـــــەی چــوارەم ④∯

⑦ تـەوحید بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بووە (سەلامی الله لە هەموویان بێت)، هەروەک الله تعالی دەفەموێت: {وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إليه أنه لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ}.

واتە: ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە ، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە : بێگومان هیچ خـودایەک نییە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن .

[ سورەتی الأنبیاء : 25 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە هەر پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکان (سەلامی الله لە هەموویان بێت) یەکەم کارێک کە بۆ بانگەوازی کردنی خەڵکی دەستیان پێکردووە فەرموویانە: {يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ} واتە : ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خـودا بپەرستن ، چونکە جگە لەو زاتە خـودایەکی ترتان نیە.

وە ئەو قسەیەش چەندین جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی نوح و إبراهیم و هود و صالح و لوط و محمد (سەلامی الله لە هەموویان بێت) ، وە هەروەها الله تعالی دەفەرموێت: {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ} واتە: سوێند بە خـودا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت : تەنها خـودا بپەرستن ، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر

[سورەتی النحل : 36 ـ تەفسیری ئاسان]

ئەوەش ئەو کارە سەرەکی و بنچینەیەیە کە سپێردراوە بە هەموو پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکان بە گشتی ( سەلامی الله لە هەمـوویان بێت ) کە ڕایبگەیەنن:

أ- ( اعبدوا الله ) خـودا بە تاک و تەنهایی بپەرستن .

ب- ( واجتنبوا الطاغوت ) وە دوور بکەونەوە لە طاغوت .

وە لە داهاتووشدا مانای طاغوت ڕوون دەکەینەوە بە یارمەتی الله تعالی .

کەواتە ئێستا بە کورتی بۆت ڕوون بوویەوە ئەوە مانای گرنگیەتی تەوحیدە وە ئەو پلەو پایە گەورەیەی هەیە لەلای الله تعالی ، وە هەروەها تەوحید ئەو حەق و مافەیە کە دەبێت تەنها بۆ الله تعالی بێت و پاک و خاوێن بێت لە هەموو شیرکێک ، وە بە هیچ شێوەیەک درووست نییە کە ئەو حەقە بدرێت بە کەسێکی تر لە شوێنی الله تعالی، ئەگەر ئەو مەخلوقە لە هەر پلەو پایەک دابێت لەلای الله سبحانە وتعالی.

کەواتە شیرک دانان بۆ الله تعالی ئەوا الله تعالی هەرگیز لە خاوەنەکەی خۆش نابێت ، وە تەوحیدیش مەرجی قبوڵ بوونی کردەوە چاکەکانە ، جا لێرەدا لەسەر هەموو کەسێکی موسلمان واجبە بەڵکو لەسەر هەموو کەسێکی عاقڵ و ژیر واجبە کە (مانای تەوحید) بزانێت ، تاوەکو ئەو حەق و مافەی الله تعالی بەجێ بهێنێت کە الله تعالی داوای لە هەموو درووستکراوەکانی پێ کردووە ، وە تاوەکو دووریش بکەوێتەوە لە شیرک بە هەموو شێوەکانیەوە .

## ∮وانـــــەی پێـنجــەم ⑤∮

### ( بەشـــی یەکـەم )

ئەوانەی بـەس بەناو خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام وا دەزانن کەوا موەحیدن لەکاتێکدا کەوا زۆربەیان ( لە حەقیقەتدا ) جاهیلن بە حەقیقەتی تەوحید بەڵکو کەوتوونەتە نێو شیرکی ئاشکرا .

وە لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی وا دەزانن کە تەوحید تەنها باوەڕ بوونە بە هەبوونی الله تعالی ، وە الله بەدیهێنەری هەموو شتێکە و دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ، وە هەروەها وا گومان دەبەن ئەگەر ئەوان إعتقاد و باوەڕیان بەمانە هەبوو لەگەڵ ئەوەش دوو شەهادەکەیان دەهێنا بەو هۆیەوە ئەوانیش یەکێکن لە موەحیدان .

وە هیچ گومانی تێدا نییە ئا ئەوانە بەشێکن لە تەوحید ، بەڵام بە تەنها ئەمانە بەس نین ، تەنها ئەگەر مرۆڤ فەرمان و کارو کردەوە و پێویستیەکانی تریشی هەمووی بە ڕێک و پێکی تەواو کرد ، کە ئەویش بریتییە لە ( بە تاک دانانی الله تعالی لە عیبادەت کردندا ) ، ئەوەش بەوە دەکرێت کە هەموو عیبادەت و بەندایەتی کردنێکی تەنها بۆ الله تعالی ئەنجام بدات ، وە نابێت بۆ غەیری الله تعالی بە هیچ شێوەیەک عیبادەت ئەنجام بدات ، وە کافر و بێ باوەڕ بێت بە هەرشتێک و بە هەرکەسێک کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرستریت ، هەروەک الله تعالی دەفەرموێت: { فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا }

واتە : جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ طاغوت ـ (کە بریتیە لە : هەموو ڕێگە و ڕێباز و هێز و بەرنامە و لادان و بتێک ) و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە خـودا ، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە ، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە ، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە [ سورەتی البقرة : 256 ــ تەفسیری ئاسان ]

جا الله تعالی کوفر کردن بە طاغوتی بە مەرج داناوە لەگەڵ ئیمان هێنان بە الله ، وە هەرکەسێک ئەمەی بەجێهێنا ( العروة الوثقی ) ( واتە : دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە ، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە ) کە ئەویش بریتییە لە ( شایەتی دان بە تەوحید و یەک خـودا پەرستی ) .

وە لە داهاتوودا بە یارمەتی الله تعالی مانای طاغوت ـیش ڕوون دەکەینەوە بإذن الله ، بەڵام بهێڵە با بابەتەکەمان بە سادەیی ڕوون بکەینەوە.

جا بە یارمەتی الله تعالی دەڵێین :

ئەو موشریک و هاوبەش دانەرانەی کەوا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆلایان ڕەوانە کرابوو إقرار ـیان دەکرد و دانیان دەنا بە هەبوون و وجودی الله تعالی وە هەروەها دانیشیان بەوە دەنا کەوا الله تعالی بەدیهێنەری هەموو شتێکە .

هەروەک الله تعالی دەفەرموێت: {وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ}.

واتە : ئەگەر لە بێ باوەڕان بپرسیت : کێ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە ؛ بێ دوودڵی و بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێن : الله [سورەتی الزمر : 38 ــ تەفسیری ئاسان].

وە هەروەها الله تعالى دەفەرموێت: {وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ}.

واتە : خۆ ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت : کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ؟ لە وەڵامدا بە دڵنیایی دەڵێن : هەر زاتی باڵادەست و زانا دروستی کردوون .

[ سورەتی الزخرف : 9 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە هەروەها الله تعالى دەفەرموێت : {قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ * سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ * قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ * سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ * قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ * سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ}

واتە : تۆش پێیان بڵێ : باشە زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین کێ خاوەنیانە ، ئەگەر زیرەك و هۆشیارن ؟ ئەگەر شت دەزانن ؟! * سەرئەنجام هەر دان بە ڕاستیدا دەنێن و دەڵێن : هەر خـودا ، خاوەنیانە ، هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە ، ئەوسا پێیان بڵێ : جا ئەوە بۆچی یاداوەری وەرناگرن ؟ * پێیان بڵێ ؛ ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیە و کێ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی گەورە و فراوانە ؟ ( ئاسمانەکان و زەوی لە بەرامبەر عەرشی پەروەردگاردا ، وەکو ئەڵقەیەکی پەنجە وایە لە پاڵ چیایەکی گەورەدا ) * سەرەنجام دەڵێن : هەر خـودا پەروەردگاریانە ، ئەوسا

بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن ؟ خۆتان ناپارێزن لە خەشم و قینی ؟ ( ئاخر ئێوە لە کێ یاخی دەبن؟ ) * ( هەروەها پێیان ) بڵێ : کێ جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە ، لە کاتێکدا هەر ئەو پەنا بەخشە و کەس ناتوانێت لە سزای ئەو زاتە ، کەس پەنا بدات ، ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزابن * ( سەرەنجام بۆ ئەمەش ) دەڵێن : هەموو ئەوانە بە دەست خـودایە ، تۆش بڵێ : کەواتە چۆن جادووتان لێ دەکرێت ؟ کە ئەمە دەزانن.

[ سورەتی المؤمنون : 89 ... 84 ـ تەفسیری ئاسان ]

جا ئەگەر کافرەکانی سەرەتا کە دانیان دەنا بە هەبوونی الله تعالی وە بەوەی کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە وە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ئەی کەواتە چۆن ئەوان موشریک بووینە ؟

وەڵام : ئەوان موشریک بوون لەبەرئەوەی ئەوان ئەو عیبادەتانەی کە تایبەتە بە الله تعالی و دەبێ هەر بۆ ئەو ئەنجام بدرێت ئەوان بۆ بت و پەیکەرەکان ئەنجامیان ئەدا ، وە لە بەرامبەریشدا کردبوویانە ( واسطة ) لەنێوان خۆیان و لەنێوان الله تعالی ، جا ئاژەڵیان بۆی سەردەبڕی وە لێی دەپاڕانەوە وە نەزرەکانیشیان هەر بۆ بتەکان ئەنجام ئەدا وە هاناو هاوار و داوای یارمەتیان هەر لە بتەکان ئەکرد وە تەواف و سوڕانەوەیان بە دەوری بتەکان دەکرد وە هەروەها سوێندیان پێی دەخوارد وە بە تەبەڕوک و پیرۆزیان ئەزانی.

بۆچی ؟

لەبەرئەوەی ئەو موشریکانە بیرو باوەڕیان وابوو کە ئەو پەیکەر و بتانە پەیکەری قەومێکی صالح و چاکەکار بووینە ، وە ئەوانیش صالح و چاکەکار بووینە و پلەو پایە و مەکانەتێکیان هەبووە لەلای الله ،

وە لێرەشدا کردبوویانە ( واسطة ) لەنێوان خـۆیان لەنێوان الله تعالى لە عیبادەت کردندا .

واتە: موشریکەکان عیبادەتیان بۆ خودی بتەکان نەدەکرد بەڵکو ئەوان دەیانگوت ئەو بتانە ( پەیکەری کەسانێکی صالح بووینە ) بۆیە دەبێتە ( واسطة ) لە نێوان ئێمە و لەنێوان الله تعالى بۆ ئەوەی عیبادەتەکانمان پێ قبول بێت.

بۆیە شوبهە و گومانیان لەسەر ئەو شیرکە ئەوەبوو کە دەیانگووت : ئەگەر ئێمە ڕاستەوخۆ عیبادەتەکانمان بۆ الله تعالى ئەنجام بدەین ئەوا ڕەنگە قبوڵ بێت وە ڕەنگە قبوڵ ـیش نەبێت ، بەڵام کاتێک ئێمە بۆ ئەو پەیکەرانە عیبادەتەکان ئەنجام ئەدەین ( کە پەیکەری قەوم و کەسانێکی صالح و چاک بووینە ) ئەوە بەڕاستی الله سبحانە وتعالى لێمانی قبوڵ دەکات لەبەرئەوەی ئەوان پلەو پایەکی زۆر گەورەیان هەیە لەلای الله تعالى ، جا بەهۆی ئەو کارەشیان کەوتبوونە نێو شیرکەوە ، لەبەرئەوەی ئەوان عیبادەتەکانیان بۆ غەیری الله ئەنجام ئەدا ، وە لەبەرئەوەش کردبوویانە ( واسطة ) لەنێوان خۆیان و لەنێوان الله تعالى ، وە ئەوە مانای ئەوەیە کە باسکرا لە وتەی الله تعالى: {أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ}

واته : ئاگاداربن: دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خـودایه ، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن : ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خـودا نزیکمان بخەنەوە ، لەکاتێکدا ئەوان لە خـوداوە نزیکترن ، بێگومان خـودا داوەری دەکات لە نێوانیاندا ، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیە و ڕایان دەربارەی جۆراو جۆرە ، بەڕاستی خـودا ئەو بیروباوەڕ چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن .

[سورەتی الزمر : 3 ــ تەفسیری ئاسان]

## ∮وانـــــەی پێـنجــەم ⑤∮

(بەشـــی دووەم ، لە وانەی پێنجەم ـدا)

وە هەروەها ئەو موشریک و هاوبەشدانەرانەی کە ئەولیاء و پیاو چاکەکانیان دەپەرست و لە شوێنی الله تعالی عیبادەت و بەندایەتیان بۆ ئەنجام دەدا دەیانگوت : لەڕاستیدا ئێمە خودی ئەو پەیکەرانە ناپەرستین بەڵکو ئێمە بۆیە دەیانپەرستین بۆ ئەوەی لە الله تعالی نزیکمان بکەنەوە: {وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلى اللَّهِ زُلْفَى} واتە : ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خـودا نزیکمان بخەنەوە [سورەتی الزمر : 3 ــ تەفسیری ئاسان]

جا لێرەدا الله تعالی حوکمی کوفری دا بەسەریان ، هەروەک دەفەرموێت : {إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ} واتە : بەڕاستی خـودا ئەو بیروباوەڕە چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن .

ڕێک وەک ئەو پیاوەی کە دەڕوات بۆلای ( گۆڕی ) خاتوو زەینەب یان حوسەین یان البدوي ... یان جگە لەوانیش ، جا لێیان ئەپاڕێنەوە یان ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕن یان تەواف لە دەوریان ئەکەن یان نەزریان بۆ ئەکەن یان هاناو هاواریان لێ ئەکەن.

جا بۆ نموونە دەڵێت : مدد یا بدوي یان مدد یا حوسەین (مَدَد : واتە : فریام کەوە یان یارمەتیم بدە)

وە دەڵێن : ئەگەر ئێمە ڕاستەوخۆ لەبەر الله بپاڕێینەوە و دوعا بکەین ڕەنگە الله تعالى قبوڵی بکات وە لەوانەشە قبوڵی نەکات ، بەڵام لەم نێوانەدا ئەگەر لەبەر حوسەین یان خاتوو زەینەب یان البدوی بپاڕێینەوە و دوعا بکەین ، ئەوا ئەوان شەفاعەت و تکامان بۆ دەکەن لەلای الله بۆ ئەوەی دوعاکانمان قبوڵ بێت و پێداویستیەکانمان بۆ جێ بەجێ بکات ، چونکە هیچ گومانی تێدا نییە الله تعالى لەوانی قبوڵ دەکات (واتە : ئەوانەیان کردووەتە ( واسطة ) لە نێوان خۆیان و لەنێوان الله تعالى لە عیبادەت کردندا).

جا هەرکەسێک ئەو کارە بکات ئەوا موشریک و هاوبەشدانەرە ، لەبەرئەوەی ئەو عیبادەتانەی کەوا تایبەتە بە الله تعالى ئەوا ئەنجامی ئەدات بۆ جگە لە الله سبحانە وتعالى ، وە ئەو پیاوچاکانەی کردووەتە ( واسطة ) لە نێوان خۆی و لە نێوان الله تعالى ـدا . وە جارێکی تریش هەمان شیرک و بت پەرستی ئەنجام دەدرێتەوە ، ئەو شیرکەی کە موشریکەکانی پێشووتر تێی کەوتبوون ، کە چەند پەیکەر و بتێکیان ئەپەرست ، وە کردبوویانە ( واسیطة ) لە نێوان خۆیان و نێوان الله تعالى لە عیبادەت کردندا .

وە ئا ئەوانە موشریک بوون و کەوتبوونە نێو شیرکەوە ، لەبەرئەوەش پێغەمبەریان (صلى الله علیه وسلم) بۆلا ڕەوان کرا بۆ ئەوەی ڕێگریان لێبکات لەم شیرکە.

وە هەروەها خەڵکانی ئێستاش ئەوانەی کە کەوتوونەتە نێو ئەم شیرکەوە بە هۆکاری ئەوەی کە وا گومان دەبەن کە هاوبەش بڕیاردان بۆ الله تعالى تەنها بریتییە لە نەفی کردنی هەبوونی الله تعالى یان نەفی کردنی ئەوەی کە الله تعالى خالق و بەدیهێنەری

هەموو شتێکە، یان هەندێکی تریان بە گومانی ئەوەی کە شیرک تەنها بەستراوەتەوە بە پەرستنی بت و پەیکەرەکان ، بەڵام پەرستن و عیبادەت کردن بۆ ئەولیاء و پیاو چاکەکان نابێتە شیرک ، وە هەندێکی تریان بە گومانی ئەوەی کە شیرک تەنها بریتییە لە پەرستنی خودی شتەکە ، بەڵام لە ڕووی عیبادەتەوە کە لە ڕێی ( الواسطة ) ئەنجام بدرێت ئەوە نابیتە کەسێکی موشریک ( واتە : لەگەڵ خـودا کەسێکی تر بپەرستیت ) لەگەڵ ئەوەی کە ئەوە هەمان ئەو شیرکەیە کە موشریکەکانی پێشووتر تێی کەوتبوون .

﴿وانـــــەی شـەشەم ⑥﴾

دەبینین کەوا شیرک و هاوبەش دانانێکی زۆر بۆ الله تعالی بڕیار ئەدرێت و سەری هەڵداوەتەوە لەم ڕۆژگارەی خۆمان ، نمونەش لەوانەی کە عیبادەتیان بۆ ئەنجام ئەدرێت و ئەپەرسترێن (الحسین ، والسیدة ، والبدوي ، والسیدة نفیسة وە جگە لەوانەش لە ئەولیاء و پیاو چاکەکان)

وە ئا لێرەدا هۆکاری نەهی و ڕێگری کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تێدەگەین لەبارەی درووستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان .

هەروەکو پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت: «لَعَنَ اللَّهُ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ».

واتە : نەفرەتی خـودا لە جولەکە و گاوڕەکان بێت چونکە قەبری پێغەمبەران و پیاو چاکەکانیان دەکردە پەرستگا و شوێنی نوێژ و خـوداپەرستی .

وە هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : «أَلَا وإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ ، أَلَا فَلَا تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ ، إِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ »

واتە : ئاگاداربن کەوا خەڵکانی پێش ئێوە قەبری پێغەمبەرەکانیان و پیاوچاکەکانیان ئەکردە مزگەوت و شوێنی خـوداپەرستی ، بۆیە ئاگاداربن کەوا ئێوە گۆڕەکان نەکەنە مزگەوت و شوێنی خـوداپەرستی ، من لەسەر ئەو کارە نەهی و ڕێگریتان لێ دەکەم.

وە هەروەها لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : «اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنًا يُعْبَدُ . اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى قَوْمٍ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»

واتە : ئەی خـودای پەروەردگار گۆڕەکەم بپارێزە تا وای لێنێت و نەبێت بە پەیکەرێک و بپەرسترێت ، خەشم و توڕەیی الله تعالی زۆرە لەسەر قەومێک کەوا گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردبوو بە مزگەوت .

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : «إِنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ ، وَمَنْ يَتَّخِذُ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ»

واتە : بەڕاستی لە خراپترینی خەڵکی ئەو کەسانەن کەوا کۆتایی دونیا دێت و قیامەت هەڵدەستێت لەکاتێکدا ئەوان زیندوون ، وە لە خراپترینی خەڵکی ئەوانەشن کە گۆڕەکان ئەکەنە مزگەوت و شوێنی خـوداپەرستی.

جا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەواڵی دا بەوەی : کەوا لە خراپترینی خەڵکی ئەو دوو صینف و جۆرە کەسانەن :

① یەکـەم : ئەو کەسانەن کەوا قیامەت بەسەریاندا بەرپا دەبێت ، لەبەرئەوەی قیامەت هەڵناستێت و بەرپا نابێت تەنها بەسەر مرۆڤی کافردا نەبێت ، هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەواڵی پێدا .

② دووەم : ئەو کەسانەن کەوا گۆڕەکان ئەکەنە مزگەوت و شوێنی خـوداپەرستی ، لەبەرئەوەی ئەو کارە دەبێتە هۆی ئەنجام دانی عیبادەت بۆ جگە لە الله تعالى.

وەک چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : «لَا تُصَلُّوا إِلى الْقُبُورِ ، وَلَا تَجْلِسُوا عَلَيْهَا» واتە : نابێت لەکاتی نوێژ کردن ڕووبکەنە قەبر و گۆڕەکان ، وە نابێت لەسەریشی دابنیشتن .

وە هەروەها لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « لَا يُصَلَّى إِلى قَبْرٍ وَلَا عَلَى قَبْرٍ » واتە : نابێت نوێژ بکرێت ڕوو بەرەو گۆڕ ، وە نابێت نوێژ لەسەر گۆڕیش بکرێت.

وعَنْ عَائِشَةَ ، أن أُمَّ سَلَمَةَ ، ذَكَرَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) كَنِيسَةً رَأَتْهَا بِأَرْضِ الحَبَشَةِ يُقَالُ لَهَا مَارِيَةُ ، فَذَكَرَتْ لَهُ مَا رَأَتْ فِيهَا مِنَ الصُّوَرِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) : « أُولَئِكَ قَوْمٌ إذا مَاتَ فِيهِمُ العَبْدُ الصَّالِحُ ، أَوِ الرَّجُلُ الصَّالِحُ ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا ، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ ، أُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ .

واتە : لە دایکمان عائیشەوە هاتووە ، کە أم سلمة باسی کەنیسەیەکی ئەکرد بۆ پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) کە بینیبووی لە خاکی حەبەشە پێی ئەوترا ( ماریة ) ، ئینجا بۆی باس دەکرد کە چۆن وێنەی زۆریان تێیدا کێشابوو ، جا

پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( ئەوانە قەومێکن ئەگەر بەندەیەکی صالح و چاکەکاریان لەنێودا مرد ، یان پیاوێکی صالح لەناویان بێت و بمرێت ، ئەوا لەسەر گۆڕەکەی نوێژگایەک ( پەرستگایەک ) دروووست دەکەن ، وە ئەو وێنانەی لەسەر ئەنەخشێنن ، ئا ئەوانە خراپترینی دروووست کراوانن لەلای الله .

جا بۆچی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نەهی کردووە و ڕێگری کردووە لە درووستکردنی مزگەوت و شوێنی عیبادەت لەسەر گۆڕەکان ؟

لەبەر ئەوەی ئەو کارە هۆکارێکی خێرایە بۆ تووش بوون بە شیرک ، ئەگەر خەڵکی هەستان بە درووستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان ، هەروەکو چۆن ئەوەش حاڵی ئێستای ( ئەو خەڵکانەیە کە تووشی شیرک بوون لە گۆڕ پەرستی )

جا بەڕاستی ئەم کارە دەبێتە هۆی گەورە کردنی ئەو مردووانەی تێیدا نێژراون ، وە دەبێتە هۆکاری بە پیرۆز دانانی مردووەکان ، چونکە لەو شوێنانە نێژراون کە تایبەتن بە پەرستن و عیبادەت ( کە مزگەوتەکانە ) .

وە ئەم گەورە کردنەش جارێکی تر دەبێتەوە هۆی باوەڕ بوون بەوەی کە ئەو مردووانە پلەو مەکانەتێکی گەورەیان هەیە لەلایەن الله ، پاشان سەردەکێشێت بۆ کردنیان بە ( واسطة ) لە عیبادەتدا لەنێوان الله تعالی و لەنێوان خەڵکی ، بۆیە خەڵکیش دەستدەکەنەوە بە دوعا و پاڕانەوە لێیان و سەربڕینی ئاژەڵ بۆیان و نەزر کردن بۆیان و هاناو هاوار و پەنا بردن پێیان.

واتە : ڕوو دەکەنە ئەو مردووانە لەو عیبادەت و بەندایەتیانەی کە تایبەتە بە الله تعالى ، وە بەم هۆیەش جارێکی تر دەکەونەوە نێو هەمان شیرک .

## ∮⑦ وانـــــەی حـەوتــەم∮

ئیشکال و گرفت هەیە لە زۆرێک لە خەڵکیدا وا گومان دەبەن کەوا عیبادەت تەنها کورت کراوەتەوە لە نوێژ ، بۆیە دەڵێن ئێمە نوێژ ناکەین بۆ ئەم گۆڕانە کە گۆڕی ئەولیاء و پیاو چاکانن ، بەڵام ئێمەش وەڵامیان ئەدەینەوە بە یارمەتی الله تعالی وە دەڵێین :

بە دڵنیاییەوە لێرەدا عیبادەتانێکی تری زۆر هەنە کە واجبە بە تاک و تەنیا بۆ الله تعالی ئەنجام بدرێت ، لەم عیبادەتانەش بریتین لە :

① پاڕانەوە ( الدعاء ) :

الله عز وجل دەفەرموێت :

{وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إذا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ}

واتە : هەردەمێ بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من ، ئەوا بێگومان من لێیانەوە نزیکم ، گیرا دەکەم نزای نزاکاران هەرکاتێک هاوار و نزام لێبکەن ، دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن وە بڕوام پێ بهێنن بەڵکو ڕێی ڕاست بدۆزنەوە .

[ سورەتی البقرة : 186 ــ تەفسیری پوختە ]

وە الله تعالی دەفەرموێت :

{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ} واتە : وە پەروەردگارتان فەرموویەتی : لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە ، بەڕاستی ئەوانەی خۆ بەگەورە دەزانن کە بمپەرستن لەمەوپاش بەسەر شۆڕی دەچنە دۆزەخەوە [سورەتی غافر : 60 ــ تەفسیری پوختە]

وە پێغەمبەری الله (صلی الله علیه سلم) فەرموویەتی : « الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ » واتە: دوعا کردن و پاڕانەوە عیبادەتە.

کەواتە هەرکەسێک لە غەیری الله تعالی بپاڕێتەوە ، بەڕاستی ئەو کەسە هاوبەش و شیرکی بۆ الله بڕیار داوە ، لەبەرئەوەی ئەو عیبادەتەی کە تایبەتە بە الله تعالی بۆ غەیری الله ئەنجامی داوە ،

هەروەها الله تعالی دەفەرموێت : {إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ}

واتە : بەڕاستی ئەوانەی کە ئێوە هاوارو داوایان لێ دەکەن جگە لە خـودا ، ئەوانیش چەند بەندەیەکن وەك خۆتان دەی بانگ و هاواریان لێ بکەن با وەڵامتان بدەنەوە ( ویستەکانتان بەجێ بهێنن ) ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن.

[سورەتی الأعراف : 194 ــ تەفسیری پوختە]

وه الله تعالی دەفەرموێت :

{وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخر لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ}

واته : هەر کەس بپەرستێ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خـودادا کە هیچ بەڵگەیەکی نەبێ ، لەسەر ئەو ( پەرستنە ) ئەوە بەڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگاریێتی، بێگومان کافران ڕزگار نابن [ سورەتی المؤمنون : 117 ـ تەفسیری پوختە ].

جا هەرکەسێک له غەیری الله تعالی پاڕایەوە وە لەسەر ئەم شیرکەی مرد ، ئەو کەسە ڕزگاری نابێت لە ئاخیرەتدا وە لە دۆڕاو و زەرەرمەندان دەبێت ، جا لێرەدا ئەو کەسانەی کە هاناو هاوار دەکەن و دەپاڕێنەوە لە خاتوو زەینەب یان حوسەین یان البدوي یان جگە لەوانیش ، ئا ئەوانە موشریک و هاوبەش بڕیاردەرن بۆ الله تعالی .

② لە جۆرەکانی عیبادەت سەربڕینی ئاژەڵە ( الذبح ) :

وە ئەم جۆرەش الله تعالی لەم ووتەیەی خۆی ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێت: {فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ} واته : دەی کەواتە نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی سەر ببڕە. [سورەتی الکوثر : 2 ـ تەفسیری پوختە]

أي : فصل لربك وانحر لربك .

واته : دەی کەواتە نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی سەر ببڕە بۆ پەروەردگارت .

وە هەروەک چۆن الله تعالی دەفەرمویت : {قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}.

واتە : ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) بڵێ : بێگومان نوێژ و ( بەندایەتی ) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ خـودای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە .

[ سورەتی الأنعام : 162 ــ تەفسیری پوختە ]

وە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ..»

واتە : لەعنەتی الله لەو کەسەی سەربڕینی بۆ غەیری الله ئەنجام داوە..

لەبەرئەوەی سەربڕینی ئاژەڵ عیبادەتێکە بۆ الله تعالی ، بۆیە هەرکەسێک ئەو کارە بۆ غەیری الله ئەنجام بدات ئەوا بەڕاستی شیرکی بۆ الله تعالی بڕیارداوە ، وە لەدوای ئەوەش شایەنی لەعنەت کردن دەبێت ، وە بەر لەعنەتی الله کەوتووە چونکە ئەوانەی ئاژەڵ سەردەبڕن بۆ ئەولیاء و پیاو چاکەکان ئەو کەسانە موشریک و هاوبەش بڕیاردەرن بۆ الله تعالی .

③ وە هەروەها لە جۆرەکانی عیبادەتدا نەزر کردنە بۆ الله تعالی :

وە ئەم جۆرەشیان الله تعالی لەم ووتەیەی ڕوونی دەکاتەوە لەبارەی مەدح و ستایشی ئیمانداران: {يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا} واتە: وەفا بە نەزر دەکەن، وە لە ڕۆژێکیش دەترسن کە بەدی و سەختی یەکەی هەمووان دەگرێتەوە .

[ سورەتی الإنسان : 7 ــ تەفسیری پوختە ]

وە الله تعالی دەفەرموێت: {ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ}

واتە : دوای ( سەربڕینی قوربانی ) چڵك و پیسی ( موو نینۆك ) لابەن بەخۆیانەوە ، وە نەزرەکانیان جێ بەجێ بکەن و تەواف ( ی ئیفاضە ) بکەن بە دەوری ماڵی دێرین و بە نرخ ـدا واتە کەعبە [سورەتی الحج : 29 ـ تەفسیری پوختە]

جا الله تعالی لەم ئایەتەدا فەرمانی کردووە بە وەفا و جێبەجێ کردنی نەزر .

وە پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت: «مَنْ نَذَرَ أن يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ ، وَمَنْ نَذَرَ أن يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ».

واتە : هەرکەسێک نەزری کرد لەسەر خۆی کە گوێڕایەڵی و پەرستشی الله بکات با گوێڕایەڵی ـیەکەی بکات ، بەڵام هەرکەسێک نەزری کرد لەسەر خۆی سەرپێچی الله بکات ئەوە با سەرپێچی نەکات .

وە هەروەها پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ ، وَلَا فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ»

واتە : نەزر کردن درووست نییە لە شتێکدا سەرپێچی الله بێت ، وە هەروەها ئەم جۆرە نەزرەش جێبەجێ ناکرێت کە مرۆڤ شتێک لەسەر خۆی واجب بکات کە موڵکی خۆی نەبێت .

وە هەر لەسەر ئەم بابەتەش ئەوانەی کە نەزر بۆ غەیری الله جێبەجێ دەکەن ئەو کەسانە موشریکن ، لەبەرئەوەی ئەو کەسانە ئەو عیبادەتەی کە تایبەتە بە الله بۆ غەیری الله جێبەجێی دەکەن، وەک کەسێک کە نەزر دەکەن بۆ حوسەین یان خاتوو زەینەب یان البدوي یان جگە لەوانیش، هەروەها دەڵێن: ئەگەر کوڕەکەم لە تاقی

کردنەوەدا (الامتحان) دەرچوو یان ئەگەر الله شیفای دا، بێگومان دەیکەمە نەزر مافورێک یان مۆمێک یان سەربڕینی ئاژەڵێک یان ماڵ و سامانێک بۆ فوڵانە سەید و خاوەن ڕێز ، جا ئەمە شیرکێکی صەریح و ئاشکرایە بۆ الله تعالی .

بەڵکو ئەگەر ئێمە بڕوانین بۆ ئەم فەرموودە گەورەیە ، کە ئەویش فەرموودەی ثابت ـی کوڕی الضحاك ـە :

وَعَن ثابت ابن الضحاك عندما قال لرسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : إِنيِّ نَذَرْتُ أن أَنْحَرَ إِبِلاً بِبُوَانَةَ ( اسم مكان) ، فَقَالَ النَّبِيُّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) : « هَلْ كَانَ فِيهَا وَثَنٌ مِنْ أَوْثَانِ الْجَاهِلِيَّةِ يُعْبَدُ ؟» قَالُوا : لَا ، قَالَ : « هَلْ كَانَ فِيهَا عِيدٌ مِنْ أَعْيَادِهِمْ ؟» ، قَالُوا : لَا ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) : « أَوْفِ بِنَذْرِكَ ، فإِنَّهُ لَا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ ، وَلَا فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ » .

واتە : لە ثابت ـی کوڕی ضحاک ـەوە ، کاتێک کەوا بە پێغەمبەری خـودای ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموو : من لەسەر خۆم نەزر کردووە کە وشترێک سەر ببڕم لە ( بُوانَة ) ( کە ناوی شوێنێک بوو ) ، جا پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) پێی فەرموو : ئایا ئەم شوێنە هیچ بتێک لە بتەکانی سەردەمی جاهیلی لێیە بپەرسترێت ؟ ، ووتیان نەخێر ، پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ئایا لەم شوێنە هیچ جەژنێک لە جەژنەکانی جاهیلی لێی ئەنجام دەدرێت؟ ووتیان : نەخێر ، پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : کەواتە نەزرەکەی خۆت لەم شوێنە بۆ خـودای پەروەردگار جێبەجێ بکە، چونکە نەزر جێبەجێ ناکرێت

لەسەرپێچی کردنی خـودای پەروەردگار ـدا ، وە هەروەها ئەو جۆرە نەزرەش جێبەجێ ناکرێت کە مرۆڤ شتێک لەسەر خۆی واجب بکات موڵکی خۆی نەبێت .

جا لەم فەرموودەیەدا دەبینین تیایدا کە پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەم هاوەڵەی بە درووستی دانەنا کە نەزرەکەی جێبەجێ بکات ، مەگەر دوای ئەوەی کە دڵنیابوو کە ئەم سەربڕینەی دەیەوێت بیکات لەم شوێنەدا نابێتە هۆی زیندوو کردنەوەی بت پەرستی کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرسترێت یان زیندوو کردنەوەی جەژنێک لە جەژنەکانی موشریکان .

وە هەروەها دەبینین کەوا پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) ڕێگری کرد لەو کارەی کە دەبێتە هۆی شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله تعالی ، وە بە درووستی دانەنا بۆ پیاوێک کە دەیویست نەزرەکەی جێبەجێ بکات ، تەنها دوای ئەوەی کە دڵنیابوویەوە کەوا نابێتە هۆی زیندوو کردنەوەی عیبادەتی غەیری الله .

<u>تێبینیەکی گرنگ //</u> پەیکەر ( الوثن ) بریتییە لە هەموو ئەو شتەی کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرسترێت تەنها بریتی نییە لە بت ، وە ئەمەش ڕوون بووەتەوە کە لەم فەرموودەیەی ئیمام مالیک هاتووە کە پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی :

«اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنًا يُعْبَدُ . اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى قَوْمٍ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»

واتە : ئەی خـودای پەروەردگار گۆڕەکەم بپارێزە تا وای لێنێت و نەبێت بە پەیکەرێک و بپەرسترێت ، خەشم و توڕەیی الله تعالی زۆرە لەسەر قەومێک کەوا گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردبوو بە مزگەوت .

جا لێرەدا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە الله تعالی پاڕایەوە بۆ ئەوەی گۆڕەکەی نەبێتە پەیکەرێک و بپەرسترێت ، بۆیە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو ئەو شتەی لە شوێنی الله دەپەرسترێت پێی دەوترێت پەیکەر (الوثن) .

## ﴿وانـــــەی هــەشـتــەم ⑧﴾

وە لە جۆرەکانی عیبادەت:

④ سوڕانەوە ( الطواف ) بە دەوری کەعبەدا : هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت: {وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ} واتە : تەواف بکەن بە دەوری ماڵی دێرین و بەنرخ ـدا واتە کەعبە .

وە هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە : «الطَّوَافُ صَلاَةٌ ، فإذا طُفْتُمْ فَأَقِلُّوا الْكَلاَمَ» واتە : تەواف کردن نوێژە ، بۆیە کاتێک تەوافتان کرد قسە کەم بکەنەوە .

جا ئەگەر تەواف کردن بە دەوری بەیت ( کەعبە ) عیبادەت بێت بۆ الله ، ئەوا بەڕاستی تەواف کردنیش بە دەوری گوڕێک ـدا شیرک بڕیاردانە بۆ الله تعالی .

بەڵکو زیاتر لە سەرووی ئەمەش ئەو کەسانەی کە گۆڕ دەپەرستن لە شوێنی الله تعالی ، وای دادەنێن کە ئەو مەزارگانەی پیرۆزە لایان حورمەت و ڕێزی زیاترە لە ئاست حەقی الله تعالی .

وە چەندین کەس دەبینین هەر لەبەر دەرگای گۆڕی خاتوو زەینەب دەست دەکات بە کڕنووش بردن و کاشی و مەڕ مەڕەکە لە زەویەکەدا ماچ دەکات پێش ئەوەی بچێتە ژوورەوە بۆ تەواف کردن بە دەوری گۆڕەکەی .

بەڵكو هەندێكیان دەچن بۆلای ئەم گۆڕانە وە لە شوێنە دوورەكانەوە دێن و خۆیان دەپێچنەوە و سەفەر دەكەن بۆلایان ، سەرەڕای نەهی كردن و ڕێگری كردنی پێغەمبەری خـودا ( صلى الله علیه وسلم ) لەم كارەدا ، كاتێک كە لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت : « لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إلى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ : المَسْجِدِ الحَرَامِ ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى »

واتە : سەفەر ناكرێت ( بۆ هیچ شوێنێک بە مەبەستی پیرۆزی ) تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت : مزگەوتی حەڕام ، وە مزگەوتی پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، وە مزگەوتی ئەقصا .

بەڵكو دەبینین كەوا هەندێک لە خەڵكی دەچن بۆ گۆڕی ( أبي الحسن الشاذلي ) لە چیای ئەسوان ، وە وادەدەنێن كەوا چوون بۆ لای ( مقامی أبي الحسن الشاذلي ) واتە چوون بۆ مزگەوتی حەرام ( بیت الله الحرام ) .

جا ئایا لێرەدا هیچ شیركێک هەیە گەورەتر بێت لەمە ؟!

5 هەروەها لە جۆرەكانی عیبادەت " سوێند خـواردنە بە الله تعالى " :

وە هەروەک چۆن ئەم جۆرەشیان پێغەمبەری خـودا ( صلى الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : « مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ » واتە : هەركەسێک سوێند بخوات بە غەیری الله ئەوا شیركی كردووە .

هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ كَانَ حَالِفًا ، فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ » واتە : هەرکەسێک سوێندی خوارد ، با بە الله سوێند بخوات یان با بێدەنگ بێت .

وە هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : « لَا تَقُولُوا: وَالْكَعْبَةِ ، وَلَكِنْ قُولُوا وَرَبِّ الكَعْبَةِ » واتە : مەڵێن : سوێند بە کەعبە ، بەڵکو بڵێن : سوێند بە پەروەردگاری کەعبە .

وە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ : وَاللَّاتِ وَالعُزَّى ، فَلْيَقُلْ : لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ »

واتە : هەرکەسێک سوێندی خـوارد و لە سوێندەکەی ووتی : سوێند بە لات و عوززا ، ئەوا با بڵێت : لا إله إلا الله.

( اللات والعزى ) دوو بت بوون کە لە جاهیلیەتدا دەپەرستران .

جا لێرەدا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی کردووە کەوا هەرکەسێک سوێندی بە غەیری الله خوارد کەفارەتی ئەم کارەی بە ووتنی ووشەی تەوحیدە .

هەتا ئەگەر سوێند خواردنەکەی بە هەڵەش ئەنجامی ـدا یان خووی پێوە گرتبوو .

پێشەوا إبن القيم ( رەحمەتی خـودای لێ بێت ) بۆ ئەم فەرموودەیە باب ـێکی داناوە تێیدا دەڵێت : ( فصل : الذاكر إذا قال هجرًا أو جرى على لسانه ما يسخط الله عز وجل )

واتە : بەشی : ئەگەر کەسێک لەیادی بێت قسەیەکی نەشیاو بکات یان ئەگەر بەسەر زمانیشی دا بێت ئەو شتەی کە الله عز وجل تورە دەکات .

کەواتە سوێند خواردن عیبادەتێکە بۆ الله ، وە هەرکەسێک سوێند بە غەیری الله بخوات ئەوا شیرکی کردووە ، بەتایبەت ئەگەر کەسێک وا دابنێت کەوا ئەو شتەی سوێندی پێ دەخوات لەبەر بە گەورە دانان بێت وە بە درووستی بزانێت سوێند خواردن پێی .

وە لێرەدا درووست نییە بۆ هیچ کەسێک کە سوێند بە غەیری الله بخوات ، وەک ئەو کەسانەی کە دەڵێن : سوێند بە پێغەمبەر یان سوێند بە کەعبە یان سوێند بە خاتوو زەینەبە یان سوێند بە حوسەین ، هتد ... جا ئەمە هەمووی نەهی لێ کراوە .

⑥ وە لە جۆرەکانی عیبادەت " ترسانە لە الله تعالی " :

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ } واتە : جائێوە لێیان مەترسن وە لە من بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن [ سورەتی آل عمران : 175 ــ تەفسیری پوختە ]

وە الله تعالی دەفەرموێت : { فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ } واتە : لە خەڵکی مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن [ سورەتی المائدة : 44 ــ تەفسیری پوختە ]

جا درووست نییە کەوا بەندە لە غەیری الله بترسێت لەو کارو بارە تایبەتەی کە هیچ کەسێک توانای بەسەریدا نییە تەنها الله تعالی نەبێت .

جا ئەگەر سەیری ئەو مانایە بکەیت وە سەیری حاڵی گۆڕ پەرست و ئەولیاء پەرستەکان بکەیت سەیری حاڵی یەکێکیان بکەیت کە ئەو ( وەلی )ـەی کە دەیپەرستێت زۆر زیاتر لێی دەترسێت زیاتر لە الله تعالى .

جا ئەگەر پێی بووترێت : سوێندت ئەدەم بە الله لەسەر ئەم شتە ، هیچ ڕێگریەک نابینێت کە سوێند بە الله بخوات بە درۆ ، بەڵام ئەگەر ( گریمان ) پێی بووترێت : سوێندت ئەدەم بە فڵانە شێخ لەسەر ئەم شتە ، " وە درۆ بێت شتەکە " ئەوا سوێند ناخوات ، وە دەڵێت : دەترسم کە خراپەیەکم تووش بێت .

جا دەیانبینیت کە ئەو مردووانە بە گەورە دادەنێن وە زیاتر لە الله تعالى دەترسن لێیان ، وە ئەو عیبادەتانەی کە تایبەتە بە الله بۆ ئەو مردووانە ئەنجام ئەدەن ، وە پلەو مەکانەت و حەقێک ئەدەن پێیان گەورەترە لەو حەق و مافەی کە ئەیدەن بە الله تعالى.

جا ئەو ووتەیەی الله سبحانە وتعالى جێبەجێ دەبێ بەسەریان کە دەفەرموێت : { وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ }

واتە : وە کاتێك یادی خـودا بکرێ بە تاك و تەنیا تێکدەچێ وە بێزار دەبێ دڵی کەسانێ کە باوەڕیان نییە بە ڕۆژی دوایی ، کەچی کاتێك ناوی پەرستراوانی بێجگە لە خـودا ببرێت یەکسەر شادو ڕووخۆش دەبن [ سورەتی الزمر : 45 ـ تەفسیری پوختە ]

وە کەواتە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا ڕوویداوە کە پیاوێک بە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله علیه وسلم )ـی ووت : ( مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ ، فقال له رسول الله ( صلى الله علیه وسلم ) : « أَجَعَلْتَنِي لِلَّهِ نِدًّا ! ، بل مَا شَاءَ اللهُ وَحْدَهُ »

واتە : خـودا حەزبکات و تۆش حەزبکەیت ، پێغەمبەریش ( صلى الله علیه وسلم ) پێی فەرموو : ئەوە تۆ منت کردە هاوەڵ و شەریکی ! ، بەڵکو بڵێ: گەر خـودا حەزبکات بەتەنها .

جا کەواتە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله علیه وسلم ) نکۆڵی کرد لەسەر ئەم پیاوە تەنها بە دەربڕینێکی لەفزی کە نێوان ویستی الله و ویستی پێغەمبەری ( صلى الله علیه وسلم ) بەیەکەوە بەستەوە ، وە ئەویش پێی فەرموو : ( ئایا تۆ منت کردە شەریک و هاوەڵ بۆ الله ! ) ، سەرەڕای ئەوەی کە پیاوەکە باوەڕی هەبوو بەوەی کە ویستی الله لە پێشترە لە ویستی هەر کەسێکی تر ، بەڵام پێغەمبەری خـودا ( صلى الله علیه وسلم ) وویستی کە ئەو دەرگایە دابخات کە سەردەکێشێت بۆ شیرک .

جا چۆنە بۆ کەسێک کە هەموو ئەو عیبادەتانەی کە تایبەتە بە الله بۆ غەیری الله ئەنجامی ئەدات ( لە پاڕانەوە و هانا بۆ بردن و نەزر کردن و سەربڕینی ئاژەڵ و تەواف کردن و ترسان و سوێند خواردن و هتد ..... )

داوای سەلامەتی لە الله دەکەین .

## ∮وانـــــەی نـۆیەم ⑨∮

چەند پاشکۆیەکی گرنگ :

① ڕەنگە کەسێک بڵێت : فولانە سەید و پیاوچاک پلەو پایەو مەکانەتێکی ئاوا و ئاوای هەیە وە بەڕاستی پیاوێکی صالح و چاکەکار بووە وە ئاوا و ئاوا چاکەی دەکرد .

جا چۆن ناتوانین ئەو پلەو پایەی کە شایەنیەتی پێی بدەین ؟

ئێمەش دەڵێین : ئەگەر جێگیربوو کە هەر کەسێک پلەو پایە و مەکانەتێکی لە ئیسلامدا هەبوو ، ئەوا ئێمەش حەق و مافی خۆی پێدەدەین ، بەوەی کە ڕەحمەتی بۆ دەنێرین وە بە چاکە باسی دەکەین وە چێژ وەرئەگرین و چاوی لێ دەکەین لە ژیانە پاکەکەیدا..

بەڵام هیچ تایبەتمەندیەک لە تایبەتمەندیەکانی الله تعالی هەرگیز پێی نادەین .

چونکە حەق و مافی الله عز وجل درووست نییە کەوا بدرێت بە هیچ کەسێک جا پلەو پایە و مەکانەتەکەی هەرچۆنێک بێت .

جا الله سبحانە وتعالی لە کتێبەکەی فەرموویەتی : { وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ }

واتە : وە خـودا فەرمانتان پێ نادات کە فریشتە و پێغەمبەران بکەن بە پەرستراوی خۆتان چۆن فەرمانتان پێ دەدات بێ بڕوابن ( کافر بن ) دوای ئەوەی کە ئێوە بڕوادار بوون ؟ [ سورەتی آل عمران : 80 ــ تەفسیری پوختە ]

جا کەواتە الله سبحانە وتعالی نەهی کردووە لەوەی کە فریشتە و پێغەمبەران بکرێنە خـودا و بپەرسترێن .

وە ڕوونی کردەوە کە ئەم کارە کوفرە " ئەگەر ئەنجام درا " سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان باشترین و ڕێزدارترینی دروستکراوانن لەلای الله ، وە بەڕێزترینیانن لەلای الله ، جا لە بابی ئەولایە کەوا نابێت کەسێکی تر لە غەیری ئەوانە بپەرسترێت ، چونکە بەڕاستی بەم کارەی دەبێتە کەسێکی موشریک ، لەبەرئەوەی لە غەیری ئەوان هەرکەسێک بێت پلەی لە خوار ئەوانەوەیە ، بۆیە ئەو کەسە سنووری بەزاندووە لەو حەق و مافەی کە بە خالص ــی هەر بۆ الله تعالی ــیە ( کە ئەویش : تەوحیــدە ) .

② الله سبحانە وتعالی دووپاتی کردۆتەوە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەریش ( صلی الله علیە وسلم ) مرۆڤە .

هەروەک چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { قُلْ إنما أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ إِنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا }

واتە : ( ئەی پێغەمبەر ( صلی الله علیە و سلم ) پێیان ) بڵێ : بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەک ئێوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت ( ئەم ڕاستیەتان تێبگەیەنم ) کە : بێگومان خـودای ئێوە خـودایەکی تاک و تەنهایە ، جا ئەوەی

دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شادببێت ، بە خۆشنودیەوە با کارو کردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بە هیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی [ سورەتی الکهف : 110 ــ تەفسیری ئاسان ]

جا بەڕاستی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) باشترینی درووستکراوەکانە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئادەمیزادێکە ، تایبەتمەندیەتی پێغەمبەرایەتی بۆی دەچەسپێنین ، وە هیچ تایبەتمەندیەکی " الألوهیة " بۆی ناچەسپێنین ، بۆیە لە پلەو پایە و مەکانەتی الله سبحانە وتعالی ــی دانانێین ، وە هیچ تایبەتمەندیەکی الله سبحانە وتعالی پێی نادەین .

بۆیە هەمانە لە پێغەمبەرەوە ( صلی الله علیه وسلم ) کە لەبارەی خۆیەوە دەیفەرموو :

« لاَ تُطْرُونِي ، كَمَا أَطْرَتْ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ ، فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ ، وَرَسُولُهُ »

واتە : بەرزم مەکەنەوە ( لە مەدح و سەنا ــدا ) هەروەک چۆن گاوڕەکان عیسای کوڕی مەڕیەم ــیان بەرزکردەوە ( تاوەکو وتیان کوڕی خــودایە ) ، بەڵکو من بەندەی خــودام ، بۆیە بڵێن : بەندەی خــودا و پێغەمبەری خــودایە .

وە الله سبحانە وتعالی لەگەڵ پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) دواوە لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرموێت : { لَيْسَ لَكَ مِنَ الأمر شَيْءٌ } واتە : ( دەربارەی هەڵهاتووەکانی شەڕی ئوحود ) بەڕاستی بەدەست تۆ نییە ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) هیچ شتێک لەو کارەدا [ سورەتی آل عمران : 128 ــ تەفسیری پوختە ]

جا ئەو ئەمر و کارو بارەی ( کە تایبەتە بە الله تعالی ) هەمووی بۆ الله ـیە چۆنی بیەوێت ئاوا بەڕێوەی دەبات بە حیکمەت و دانایی خۆی سبحانە وتعالی ، جا ئەگەر گریمان کەوا ئەم کارو بارە لە حەق و مافی پێغەمبەر بووایە (صلی الله علیە وسلم) کە بەڕێزترینی درووستکراوەکانە ، ئەوا چ باکمان بە کەسێکی تر دەبوو کە ئەو کەسە پلەو مەکانەتی نزمترە لەنێو درووستکراوەکان ؟

وە لەگەڵ ئەمەشدا ئەو شتەی کە لە زۆرێک لە خەڵکی دەیبنین کە ئەم درووستکراوانە لە سەرووی پلەو مەکانەتی ئەوان دادەنێن وە اعتقاد و باوەڕیشیان بەو کارە هەیە ، لەکاتێکدا شایەنی هیچ کەسێک نییە کە پێی بدرێت تەنها الله تعالی نەبێت .

( والله علی کل شيءٍ قدیر )

## ﴿وانـــــەی دەیــەم ⑩﴾

③ ئەگەر هاتوو کەسێک ووتی :

بەڕاستی مەشهورە لە موشریکەکانی پێشووترەوە ئەوانەی کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆلایان ڕەوانە کرا ، کەوا ئەوان ئیمان و باوەڕیان نەدەهێنا بە الله ، بەڵکو ئیمانیان هەبوو بەوەی کە ئەم بتانە پەرستراو و خـودایانە، لەکاتێکدا ئەو کەسانەی کە گۆڕ دەپەرستن لەم سەردەمەدا ئیمان و باوەڕیان هەیە بە الله ، وە هەروەها ناڵێن کە ئەم ئەولیاء و گۆڕانە هاوتا و شەریکن بۆ الله وە یان بڵێن پەرستراون ئەمانە ؟

دەڵێین : بێگومان ئەم زانیاریانە هەڵەی تێدا کراوە و ڕاست نییە ، سەرچاوەی ئەم قسانە تەلەفزیۆن و جاهیلەکانن .

بەڵام کتابی الله تعالی ، پاشان زانایانی سەلەف ئەوا بەم شێوانە ڕوونیان کردۆتەوە:

موشریکەکانی پێشووتر باوەڕیان هەبوو بە وجود و هەبوونی الله تعالی ، نەوەک هەر ئەمە بەڵکو باوەڕیان هەبوو بەوەی کە " الخالق " بەدیهێنەری هەموو شتێکە ، " الرازق " ڕۆزی بەخشی هەموو شتێکە ، هەروەک چۆن الله تعالی دەفەرموێت: { وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ } واتە : وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ دروستی کردوون بێگومان دەڵێن الله [ سورەتی الزخرف : 87 ــ تەفسیری پوختە ]

وە هەروەها الله تعالی دەفەرموێت : { وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ } واتە : وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی کێ ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە ؟ بێگومان دەڵێن الله ـی بە دەسەڵاتی زانا دروستی کردوون .

[ سورەتی الزخرف : 9 ـ تەفسیری پوختە ]

وە جگە لەم ئایەتانەش چەندین ئایەتی تریش هەیە ،کە لە پێشووتر باسکرا کۆمەڵێک لە ئایەتەکان کە بەڵگە بوون لەسەر ئەم مانایە لە سەرەتای قسەکانماندا .

بەڵام ( موشریکەکانی پێشووتر ) تووشبوونیان بە شیرک بە هۆکاری ئەوە بوو کە بتەکانیان کردبووە ( واسطة ) لەنێوان خۆیان و لەنێوان الله ـدا لە عیبادەتەکاندا ،

هەروەک چۆن الله تعالی لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلى اللَّهِ زُلْفَى } واتە : وە کەسانێ جگە لەو ( خـودا ) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە ( دەڵێن ) تەنها لەبەر ئەوە دەیان پەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خـودا [ سورەتی الزمر : 3 ـ تەفسیری پوختە ]

وە هەروەها الله تعالی لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَـؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ ... } واتە : ئەوانە بێجگە لە خـودا شتانێك دەپەرستن کە نە زیانیان پێ دەگەیەنن نە سوود و قازانج ، وە دەڵێن ئەو بتانە تکا کارمانن لای خـودا [ سورەتی یونس : 18 ـ تەفسیری پوختە ]

کەواتە ئەوان بە مەبەستی نزیک بوونە بۆلای الله تعالی ئەم کارانەیان دەکرد لە ڕێگای ئەم بتانە ، جا کردبوویانە " واسطة " لەنێوان خۆیان و لەنێوان الله لە عیبادەتەکاندا ، وە هەروەها دەیانگووت : بەڕاستی ئەم بتانە لە داهاتوودا بۆمان دەبنە شەفاعەتکار و تکاکار لەلای الله تعالی .

بۆیە هەمانە لە پەروەردگارمان سبحانە وتعالی کە بۆ ئەم موشریکانە ئەندازەیەک لە ئیمانی چەسپاندووە ، کە ئەویش بریتییە لەوەی کە ئیمانیان هەیە بەوەی کە الله " خالق " بەدیهێنەری هەموو شتێکە ، وە " رازق " ڕۆزی بەخشە بۆ هەموو شتێک ، وە هەڵسوڕێنەر و بەڕێوەبەری هەموو شتێکە ، بەڵام ئەم ئەندازەیە هیچ سودێکی نەبوو بۆیان لەبەر ئەو شیرکەی کە تووشی ببوون لە ( الألوهية )ـدا ، کاتێک کە تاییەتمەندیەکانی الله سبحانە وتعالی ئەنجامیان ئەدا بۆ بتەکان ،

وە هەروەها ئەم ئەندازەیەش ڕوونە لەم ووتەیەی الله تعالی ـدا کە لەبارەی موشریکەکان فەرموویەتی : { وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللّهِ إِلاَّ وَهُم مُّشْرِكُونَ }

واتە : وە خۆ بەشی زۆری ئەو خەڵکەش کە باوەڕ دێنێت ، هەر موشریك و بتپەرستە! چاك دەزانن کە خـودا دروستکەری بوونەوەرە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بتەکانیش دەپەرستن ! [ سورەتی یوسف : 106 ــ تەفسیری ڕامان ]

جا ئەو موشریکانە ئەندازەیەک لە ئیمانیان لەلایە ، لەگەڵ تووش بوونیان بە شیرک.

قال إبن عباس : ( مِنْ إِيمَانِهِمْ إذا قِيلَ لَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ ، وَمَنْ خَلَقَ الْأَرْضَ ، وَمَنْ خَلَقَ الْجِبَالَ ؟ قَالُوا : اللَّهُ ، وَهُمْ مُشْرِكُونَ به )

هاوەڵی خۆشەویست عبدالله کوڕی عەباس دەفەرموێت : لە ئیمانی ئەم موشریکانە ئەوەیە کە ئەگەر پێیان بگوترێت : کێ ئاسمانی دروست کردووە ، وە کێ زەوی دروست کردووە ، وە کێ چیاکانی دروست کردووە ؟ ئەوە وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن : الله دروستی کردوون ، لەکاتێکیشدا موشریک و هاوبەش بڕیاردەرن بۆ الله .

وقالت طائفة من السلف : (تسألهم من خلق السموات ومن خلق الأرض فيقولون الله ، وهم مع هذا يعبدون غيره)

وە هەروەها کۆمەڵێک لە سەلەف فەرموویانە :

پرسیاریان لێ بکەیت کە کێ ئاسمانەکانی دروست کردووە ، وە کێ زەوی دروست کردووە ، ئەوا دەڵێن : الله ، وە ئەوان لەگەڵ ئەم باوەڕەش غەیری الله تعالی دەپەرستن.

وە ئا بەم شێوەیە دەبینیت کەوا قەبر پەرستەکان و گۆڕ پەرستەکان هەمان ئەو شیرکە ئەنجام ئەدەن کە موشریکەکانی پێشووتر ئەنجامیان ئەدا لەوانەیە زۆر زیاتریشی بکەن ، چونکە الله تعالی لەبارەی موشریکەکانی پێشووتر بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت : { فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلى الْبَرِّ إذا هُمْ يُشْرِكُونَ }

واتە : ئینجا کاتێ ئەو ( بێ باوەڕانە ) سوار کەشتی دەبن (و ترسان لە نوقم بوون) تەنها هاوار لە خـودا دەکەن بە دڵسۆزی و گەردن کەچی ـیەوە ، کەچی کاتێ خـودا ڕزگاریان دەکات و دەگەنە وشکانی کوت و پڕ ئەوان هاوبەش بۆ خـودا دادەنێن .

[ سورەتی العنكبوت : 65 ــ تەفسیری پوختە ]

جا کافرەکانی پێشووتر لەبەر غەیری الله دەپاڕانەوە ، بەڵام ئەگەر کاتێک کە سواری کەشتی ئەبوون و ترسی نقوم بوونیان لێ دەنیشێت ، ئەوا بە تاک و تەنهایی لەبەر الله دەپاڕێنەوە ، { فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ }

جا ئەگەر الله تعالی ڕزگاریانی کردبوایە بۆ ووشکانی و گەیشتبانەوە خۆشگوزەرانی ، دووبارە دەستیان دەکردەوە بە پاڕانەوە لەبەر پەیکەرەکان .

{ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إلى الْبَرِّ إذا هُمْ يُشْرِكُونَ }

بەڵام گۆڕ پەرست و قەبر پەرستەکانی ئێستا ، ئەوا لە خۆشی و ناخۆشیدا شیرک و هاوبەش بڕیارئەدەن بۆ الله ، بەڵکو ڕەنگە ئەگەر یەکێکیان ئازار و ناخۆشیەکی زۆری تووش ببێت ، ئەوا خێرا و دەستبەجێ و زۆر زیاتر پەنا دەبات بۆلای وەلیەکەی.

∮( 11 )وانـــــەی یازدەیەم∮

④ ئەگەر گوتت : بۆچی خەڵکانی پێشووتر پەیکەرەکانیان کردبوویە خـودا ، ئینجا لەبەریان دەپاڕانەوە و ئاژەڵیان سەردەبری بۆیان و دەیانپەرستن ؟

ئێمەش پێت دەڵێین : " وەڵام "

ئەمە لە تەفسیردا وارید بووە لەم ووتەیەی الله تعالی کە فەرموویەتی : { وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا * وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالاً }

واتە : وە وتیان : دەست هەڵنەگرن لە بت و خوداکانتان وە دەست هەڵنەگرن لە ( پەرستنی ) ود و سواع و یەغووث و یەعوق و نەسر ★ وە بەڕاستی ئەوانە زۆر ( خەڵك )ـیان گومڕا کرد ( خـودایە ) ئەم ستەمکارانە لە گومڕایی زیاتر هیچی تریان بۆ زۆر مەکە [ سورەتی نوح : 23 ـ 24 ـــ تەفسیری پوختە ]

واتە : موشریکەکانی قەومی نوح هەندێکیان بە هەندێکی تریان ووت ، وە هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێکی تریان دەکرد بە واز لێنەهێنانی ئەم خودا و پەیکەرانە ، وە بە واز لێنەهێنانی عیبادەت کردن بۆ ( ود و سواع و یەغوث و یەعوق و نەسر )

جا ئەم پێنجە کێ بوون ؟

ئەم پێنجە ناوی ئەم پەیکەرانە بوون کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرستران .

( قال البخاري : عن إبن عباس :

« أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إلى قَوْمِهِمْ ، أن انْصِبُوا إلى مَجَالِسِهِمُ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ أَنْصَابًا ( أي حجارة على هيئة تماثيل لهم ) وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ ، فَفَعَلُوا ، فَلَمْ تُعْبَدْ ، حَتَّى إذا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ العِلْمُ عُبِدَتْ » )

وكذا هو قول عكرمة والضحاك وقتادة وابن إسحق .

واتە : پێشەوا بوخاری دەگێڕێتەوە : لە عبداللە کوڕی عباس ( اللە لێی ڕازی بێت ) کە فەرموویەتی :

ناوی ئەم بتانە ناوی پیاوە چاکەکارەکانی قومی نوح ـن ، جا کاتێک ئەوان مردن ، شەیتانیش چوو بۆلای قەومەکەیان و خستیە نێو دڵیانەوە ، بەوەی کە لە مەجلیسەکانیان کە دائەنیشتن تیایدا بت بتاشن و بەناوی ئەوانی بکەن و دایبنێن ، ئینجا ئەوانیش ئەم کارەیان کرد ، بەڵام ئەوان نەیان دەپەرستن ، هەتا ئەوانیش مردن و علم نەما ( نەفامی و نەزانی بڵاو بۆوە ) ئەوجا پەرستیانن .

ئا ئەمەش ووتەی عکرمة و الضحاك و قتادة و إبن إسحاق ـە

(وروى ابن جرير عن محمد بن قيس في تفسير الآية : كَانُوا قَوْمًا صَالِحَيْنَ مِنْ بَنَى آدَمَ، وَكَانَ لَهُمْ أَتْبَاعٌ يَقْتَدُونَ بِهِمْ ، فَلَمَّا مَاتُوا قَالَ أَصْحَابُهُمُ الَّذِينَ كَانُوا يَقْتَدُونَ بِهِمْ : لَوْ صَوَّرْنَاهُمْ كَانَ أَشْوَقَ لَنَا إلى الْعِبَادَةِ إذا ذَكَرْنَاهُمْ، فَصَوَّرُوهُمْ، فَلَمَّا مَاتُوا، وَجَاءَ آخَرُونَ دَبَّ إِلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ، فَقَالَ : إنما كَانُوا يَعْبُدُونَهُمْ ، وَبِهِمْ يُسْقَوْنَ الْمَطَرَ فَعَبَدُوهُمْ . )

واتە : إبن جەریر لە محمدی کوڕی قەیس ـەوە ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا :

ئەمانە کەسانێکی صالح و چاکەکار بووینە لە نێوان پێغەمبەر ئادەم و نێوان پێغەمبەر نوح ( علیهم السلام ) ژیاون ، خەڵکێکی زۆر شوێنیان کەوتوون ، جا کاتێک مردن ، هاوەڵەکانیان ئەوانەی شوێنیان کەوتبوون ووتیان : خۆ ئەگەر وێنەیان بکێشین لەبەر چاومان بن خـودا ناسیەکەمان چاکتر و بەلەزەت تر دەبێت ، ئینجا وێنەیان کێشان ، جا کاتێک ئەوانیش مردن ، وە خەڵکانی دوای ئەوان هاتن و ئیبلیس ـیش ڕۆیشت بۆلایان و خستیە دڵیانەوە ، گوتیان : بۆیە دەیانپەرستین چونکە بەهۆی ئەوانەوە بارانیان بۆ باریوە ، پاشان پەرستنیان .

( وروى ابن أبي حاتم .. عن أبي المطهر عن أبي جعفر : وكانوا قد ذكروا عنده يزيد بن المهلب فقال : " أَمَا إنه قُتِلَ فِي أَوَّلِ أَرْضٍ عُبد فِيهَا غيرُ اللَّهِ . ؛

• قَالَ : ثُمَّ ذَكَرَ ( وَدًّا )، قَالَ : وَكَانَ ( وَدٌّ ) رَجُلاً مُسْلِمًا وَكَانَ مُحَبَّبًا فِي قَوْمِهِ ، فَلَمَّا مَاتَ عَسْكَرُوا حَوْلَ قَبْرِهِ فِي أَرْضِ بَابِلَ وَجَزِعُوا عَلَيْهِ ، فَلَمَّا رَأَى إِبْلِيسُ جَزَعهم عَلَيْهِ ، تَشَبَّهَ فِي صُورَةِ إِنْسَانٍ ، ثُمَّ قَالَ : إِنِّي أَرَى جَزَعَكُمْ عَلَى هَذَا الرَّجُلِ ، فَهَلْ لَكَمَ أن أُصَوِّرَ لَكُمْ مثله ، فيكونَ في ناديكم فتذكرونه ؟ قالوا : نَعَمْ ، فصُوِّر لَهُمْ مَثَلُهُ ، قَالَ : وَوَضَعُوهُ فِي نَادِيهِمْ وَجَعَلُوا يَذْكُرُونَهُ . فَلَمَّا رَأَى مَا بِهِمْ مِنْ ذِكْرِهِ قَالَ : هَلْ لَكُمْ أن أَجْعَلَ فِي مَنْزِلِ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْكُمْ تِمْثَالاً مِثْلَهُ ، فَيَكُونَ لَهُ فِي بَيْتِهِ فَتَذْكُرُونَهُ ؟ قَالُوا : نَعَمْ . قَالَ : فَمَثَّلَ لِكُلِّ أهل بَيْتٍ تِمْثَالاً مِثْلَهُ ، فَأَقْبَلُوا فَجَعَلُوا يَذْكُرُونَهُ بِهِ ، قَالَ : وَأَدْرَكَ أَبْنَاؤُهُمْ فَجَعَلُوا يَرَوْنَ مَا

يَصْنَعُونَ بِهِ ، قَالَ وَتَنَاسَلُوا ودَرَس أَمْرُ ذِكْرِهِمْ إِيَّاهُ ( أي : اندثر )، حَتَّى اتَّخَذُوهُ إِلَهًا يَعْبُدُونَهُ مَنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلَادُ أَوْلَادِهِمْ ، فَكَانَ أَوَّلَ مَا عُبِدَ مِنْ غَيْرِ اللَّهِ : الصَّنَمُ الَّذِي سَمَّوْهُ وَدًّا " . ) [ تفسير ابن كثير ]

واته : ( وَدٌّ ) پیاوێکی موسلمان بووە ، وە کەسێکی خۆشەویست بووە لەنێو قەومەکەیدا ، جا کاتێک مرد لە دەوری گۆڕەکەی کۆببونەوە لە خاکی بابل وە زۆر دڵتەنگ و بە پەژارە بوون بۆی ، جا کاتێک ئیبلیس بینی کەوا ئاوا دڵتەنگن بۆی ، خۆی هێنایە سەر شێوەی مرۆڤێک ، ئینجا گوتی : دەبینم کەوا زۆر نیگەرانی و غەمگینی دەردەبڕن بۆ ئەم پیاوە ، جا ئایا بۆچی ئێوە وێنەیەکی هاوشێوەی ئەو ناکێشن ، وە لە یانەی کۆبونەوەکانتانـدا دایبنێن بۆ ئەوەی ناوی بهێنن و باسی بکەن ؟

ئەوانیش گوتیان: بەڵێ، ئینجا وێنەیەکی هاوشێوەی ئەویان کێشا ، گوتی : وە ئەوانیش لە یانەی کۆبوونەوەکانیان دایاننا ، وە ناوی ئەویان دەهێنا و باسیان دەکرد ، جا کاتێک بینی کەوا چۆن باسی دەکەن گوتی: ئایا بۆچی ئێوە لە ماڵی هەر یەک لەئێوە پەیکەرێکی هاوشێوەی ئەو ناتاشن، بۆ ئەوەی هەر یەک لە ماڵەکەی خۆیدا هەیبێت و باسی بکەن و ناوی بهێنن ؟ ئەوانیش گوتیان بەڵێ ، گوتی : ئینجا بۆ ئەهلی هەر ماڵێک پەیکەرێکیان هاوشێوەی ئەو کێشا، ئینجا ڕوویان تێدەکردن و باسیان دەکرد و ناویان دەهێنا، گوتی: وە ئینجا مناڵەکانیان پێگەیشتن ، ئەوانیش ئەو کارەیان کرد کە دەیانبینی گەورەکانیان دەیکەن، گوتی : وە ئەوانیش وەچەیان خستەوە وە شوێنەواری ئەو کارەیان دیار نەما کە لە تەنها باس کردنیان بوو ( واتە : فەوتا و نەما)

تاوەکو منالّی منالّەکانیان کردیان بە خودا و دەیانپەرست لە شوێنی اللە، بۆیە یەکەم شتێک بوو کە لە غەیری اللە دەپەرسترا : ئەو بتە بوو کە پێی دەوترا (وَد).

کەواتە لەگەڵمان ڕۆشنبوویەوە کەوا یەکەم پەیکەر کە لەلایەن مرۆڤایەتیەوە دەپەرسترا لە شوێنی اللە تعالی ، وە لەبەر ئەم کارەش نوح ( سەلامی اللە لێی بێت ) بۆ لایان ڕەوان کرا .

ئەم بتانە بتی کەسانێکی چاکەکار بوون ، خەڵکی دەیانویست کە پەیڕەویان لێ بکەن وە بە مەبەستی بە یاد هێنانەوەی عیبادەتەکانیان بۆ اللە ، بەڵام شەیتان بەردەوام بوو بۆ لە خشتە بردنیان ، تاوەکو سەریانی لێ شێواند و خستنیە نێو ئەنجام دانی عیبادەت بۆ ئەم بتانە و بۆ خودی بتەکە.

وە جەهل و نەزانیش یەکێک بوو لەم هۆکارانە ، هەروەک پێشتر باسکرا لە ڕیوایەتی إبن عباس و غەیری ئەویش : ( حَتَّى إذا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ العِلْمُ عُبِدَتْ )

واتە : هەتا کاتێک ئەوانیش مردن و علم نەما ( نەفامی و نەزانی بڵاو بۆوە ) ئینجا پەرستیانن ، وە هەمان ئەم مانایەش دووبارە بۆتەوە لەسەر ئەم ڕۆژانەی کە ڕابردووە ، لەو شوێنەی کە خەڵکی دەیانەوێت ڕێز بگرن لە آل بیت ــی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) و ئەولیاء و پیاوچاکان ئەوا دێن دایاندەنێن لەنێو مزگەوتەکاندا ( ئەو جێگایەی کە شوێنی عیبادەتە بۆ اللە تعالی ) لەم کارەشدا کە دەیکەن دەبێتە هۆی گەورە کردنیان و ئەنجامدانی عیبادەت بۆیان لە شوێنی اللە .

∯( 12 )وانـــــەی دوانزەیەم∯

هەر بەردەوامین لە گفتوگۆ کردن لەبارەی شیرکی گۆڕ پەرستەکان :

⑤ لەمەوە بۆت ڕوون دەبێتەوە جەهل و نەزانی گۆڕ پەرستەکان و شێخە گومڕاکان ، ئەوانەی کە فەتوا بۆ خەڵکی دەدەن بە ئەنجامدانی شیرک ، کەوا الله تعالی دەفەرموێت : { وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا } واتە : وە خـودا وەحی بۆ کردوم کە بەڕاستی مزگەوتەکان تایبەتی خـودان ، جا لەگەڵ خـودادا هاوار و هانا بۆ کەسی تر مەبەن [ سورەتی الجن : 18 ـ تەفسیری ڕامان ]

- جا مزگەوتەکان بە تەنها تایبەتی خـودان ، وە بۆ هیچ لە مەخلوق و درووستکراوێکی تر نییە ، وە ئەویش شوێنی عیبادەت و بەندایەتی کردنی الله تعالی ـیە بە تاک و تەنها.

- پاشان الله سبحانە وتعالی دڵنیایی دەکاتەوە : { فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا } واتە : جا لەگەڵ خـودادا هاوار و هانا بۆ کەسی تر مەبەن .

جا چی دەڵێیت بە کەسێک کە هانا و هاوار دەبات و دەپاڕێتەوە لەبەر حوسەین و خاتوو زەینەب و البدوي وە جگە لەوانیش لە ئەهلی نێو گۆڕەکان .

ئایا ئەمە هەمان پێچەوانە کردنی فەرمانی الله تعالی نییە ، وە هەمان شیرک و هاوبەش بڕیاردان نییە بۆ الله ( کە وەک چۆن موشریکەکانی پێشووتر دەیانکرد ) ؟

⑥ وە ئەگەر کەسێک گووتی :

ئێمە آل بیت ـمان خۆشدەوێت و ئەولیاء و پیاوچاکەکانمان خۆشدەوێت ،

-ئێمەش پێیان دەڵێین :

وە ئێمەش بەهەمان شێوە آل بیت ـمان خۆش دەوێت وە ئەولیاء و پیاوچاکەکان ـیشمان خۆش دەوێت ، وە خۆشەویستی ئێمە بۆیان بریتییە لەوەی کە ڕەحمەتی الله بۆیان دەنێرین وە داوای ڕازی بوونی الله دەکەین بۆیان وە چاویان لێ دەکەین لە ئەنجام دانی کردەوە چاکەکان .

بەڵام خۆشەویستی ئێمە بۆیان هەرگیز بڕیار نادات بەوەی کە لە شوێنی الله تعالی بیانپەرستین ، جا جیاوازی نییە پەرستنەکە بۆ خودی خۆیان بیت یان بیانکەینە وەک ( واسطة )ـیەک لەنێوان خۆمان و لەنێوان الله سبحانە وتعالی ، چونکە بە دڵنیاییەوە عیبادەت و بەندایەتی کردن حەق و مافێکە کە پێویستە ئەنجام بدرێت بۆ الله تعالی بە تاک و تەنها .

⑦ وە ئەگەر ووتت :

موشریکەکانی سەرەتا یان پێشووتر ناویان لە بت و پەیکەرەکانیان نابوو ( آلهة ) واتە: پەرستراو و خودا ، بەڵام خەڵکی ئەم سەردەمە بە ئەهلی ناو گۆڕەکان ناڵێت پەرستراو و خودا وە نە دەڵێت ئەمە هاوبەش و هاوتای الله ـیە .

پێیان دەڵێین : موشریکەکانی پێشووتر علم و زانیاریان هەبوو بە زمانەوانی و ماناکانی ، بۆیە لێرەدا خەڵکی بەم پەیکەرانەیان دەگوت پەرستراو و خودا ، لەبەرئەوەی علم و تێگەیشتنیان هەبوو بەوەی کە هەر شتێک لە شوێنی الله بپەرسترێت پێی دەوترێت خودا ، وە ئەگەر چی خودایەکیش بێت کە جێگای باوەڕ نەبێت و تەنها بانگەشە بێت .

- وە ئا ئەمەش الله تعالى ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێت : { فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ }

واتە : جا ئەو بتانەی کە بەتەما بوون لە خـودا نزیکیان بخەنەوە و لەکاتی تەنگانەدا فریایان بکەون !! دەبا فریایان بکەوتنایە ؟! بەڵکو هەر لێیان وون بوون و ئاسەواریان نەما ، ئا ئەوەبوو درۆکانیان و ئەوەش بوو کە هەڵیاندەبەست ( کە گوایە ئەم بتانە بۆیە دەپەرستن تا لە خـودا نزیکیان بکەنەوە ، فریایان بکەوە! ) .

[ سورەتی الأحقاف : 28 ـ تەفسیری ئاسان ]

واتە : دەی فریایان کەوتن و بە هانایان هاتن ئەو هاوتا و هاوبەشانەی کە لە شوێنی الله کردبوویان بە خودا ؟

بەڵکو هەر لێیان بزر بوون ، وە ئا ئەمەبوو درۆکەیان و قسە هەڵبەستنەکەیان ، جا پەرستراو و خودا ( آلهة ) لێرەدا بریتییە لە خودایەک کە نە جێگای باوەڕە نە جێگای متمانەیە بە گوێرەی ئەو بانگەشەیەی کە کافرەکان دەیکەن نەوەک بانگەشەیەک کە لەسەر ڕوویەکی حەقیقی و ڕاستەقینەیە .

وە بڕوانە بۆ ئەم وتەیەی الله تعالى کە دەفەرموێت :

{قُلْ أَرَأَيْتُمْ شُرَكَاءكُمُ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا فَهُمْ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّنْهُ بَلْ إِنْ يَعِدُ الظَّالِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا} واتە : ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) بڵێ : هەواڵم بدەنێ ئەو هاوبەشانەی لە جیاتی خـودا دەتانپەرستن ( هاوارتان لێ دەکردن ) نیشانم بدەن لە زەویدا چیان درووست کردووە ؟ یا لە بەدی هێنانی ئاسمانەکاندا بەشداری ( خـودا ) ـیان کردووە ؟ یا کتێبێکمان پێ داون جا بەڵگەیان لەو کتێبەدا هەیە ( کە بتەکان هاوبەشی خـودان ) ( نەخێر وانییە ) بەڵکو ستەمکاران هیچ بەڵێنێ بەیەکتری نادەن جگە لە فریودان ، واتە : هەڵخەڵەتاندن [ سورەتی فاطر : 40 ــ تەفسیری پوختە ].

- وە دەبینین کە لەم ئایەتەدا الله تعالى ئاراستەی موشریکەکان ئەکات و ئینکاری و ناڕەزایی لەم کارەیان دەکات کە ئەو شەریک و هاوبەشانەی کە لە شوێنی الله دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕانەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئەو شەریک و هاوبەشانە هیچ

شتێکیان له زەویدا درووست نەکردووە و بەدی نەهێناوە وە بەشداریش نەبووینە لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان ، وەک ئەو مانایەی کە مادام ئەوان هیچ شتێکیان بەدینەهێناوە و درووست نەکردووە جا چۆن دەیانپەرستن .

جا ئەو خـودایەی کە هەموو ئەو شتانە بەدیدەهێنێت هەر ئەویش شایستەی عیبادەت و بەندایەتی بۆ کردنە ، وە ئەم واتایەش زۆر دووبارە بۆتەوە لەنێو قورئاندا .

هەروەک چۆن الله تعالی دەفەرموێت :

{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ * الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاء بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ }

واتە : ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بەڵکو بەو پەرستشە خۆتان بپارێزن ★ ئەو ( خـودایەی ) کە زەوی بۆ ڕاخستوون وە ئاسمانی بۆ کردوون بە کۆشک - ئاسمانی بۆ گێڕاون بە گومەزی - وە ئاوی ( بارانی ) لە ئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ، ئینجا دەری هێناوە بەو ئاوە هەموو جۆرە میوە و بەرێک بۆ ڕۆزیی ئێوە کەواتە هاوتا بۆ خـودا پەیدامەکەن کە ئێوە خۆتان دەزانن بێ هاوتایە [ سورەتی البقرة : ٢١ ــ ٢٢ ــــ تەفسیری پوختە ]

جا لێرەدا الله تعالی ڕوونی کردەوە کەوا الله هەر خۆی " الخالق " بەدیهێنەری هەموو شتێکە بە تاک و تەنها ، ئەوا درووستیش نییە کە لە غەیری ئەو بپەرسترێت .

وە بە کورتی :

مانای ( الآلهة ) ( الآلهة و پەرستراوی موشریکەکانی پێشوتر ) بریتییە لە پەرستراو و خودایەکی باطل ، نەوەک بەو مانایەی کە ئەو خودایە " خالق " و بەدیهێنەرە ، بەڵام بە مانای ئەوەی کە ئەوان لە شوێنی الله دەیپەرستن ، جا هەر شتێک کە بپەرسترێت پێی دەوترێت ( الآلهة ) پەرستراو و خودا ، ( جا یەکسانە خودایەکی بە حەق بێت یان باطل بێت ) بۆیە بەڕاستی ئەمەیە مانای ووتەی ( لا إله إلا الله ) واتە : ( لا معبود بحق إلا الله ) واتە : هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە تەنها الله نەبێت .

"بەشی یەکەم لە " وانـــــەی سیـانزەیەم ( 13 )

⑧ ڕەنگە کەسێک بێت و بڵێت :

بەڵام موشریکەکان لە ڕابردوودا ڕەتیان دەکردوە کە بڵێن " لا إله إلا الله " بەڵام ئەوەتا ئێمە دەڵێین : " لا إله إلا الله " جا چۆن ئەم قسەیە بەڕاست دادەنرێت بەوەی کە ئەو خەڵکانە کەوتوونەتە نێو هەڵگەڕانەوە " الردة " وە کەوتوونەتە نێو شیرکەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئەوکەسانە دانیان ناوە بە " لا إله إلا الله وأن محمدًا رسول الله ؟

- وەڵام بریتییە لەمانەی خـــــوارەوە :-

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ڕوونی کردوەتەوە کەوا لە ئوممەتەکەیدا کەسانێک هەنە کە دەکەونە نێو شیرکەوە .

هەروەک چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : «.. وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ ، حَتَّى تَعْبُدَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي الْأَوْثَانَ ، وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي كَذَّابُونَ ثَلَاثُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أنه نَبِيٌّ ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لَا نَبِيَّ بَعْدِي » واتە : وە قیامەت هەڵناستێت هەتاوەکو چەند قەبیلەیەک لە ئوممەتەکەی من ئەچنەوە ڕیزی موشریکەکان ( لە ئیسلام پاشگەز ئەبنەوە )، وە هەتاوەکو چەند قەبیلەیەک لە ئوممەتی من بتەکان ئەپەرستنەوە ، وە لە ئوممەتەکەمدا 30 کەسی درۆزن پەیدا دەبن هەر یەکێک لەوان خۆی پێ پێغەمبەرە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێغەمبەرە ، بەڵام من کۆتایەمینی پێغەمبەرانم هیچ پێغەمبەرێک لە دوای منەوە نایەت .

وە هەروەها پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلَيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ عَلَى ذِي الخَلَصَةِ » .

واتە : قیامەت هەڵناسێت تاکو سمتی ڕانی ئافرەتانی ( دەوس ) هەندە نەئاوسێت ( کە بەهۆی بەردەوامی سواری وشتر و ئەسپەکانیانەوە ئەبێت ) کە ئەچن بۆ پەرستنی ( ذِي الْخَلَصَة ) و بەدەوریدا ئەخولێنەوە .

جا لێرەدا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەواڵیدا کەوا قیامەت هەڵناستێت هەتاوەکو ئافرەتانی تیرەی ( دەوس ) ئەچن تەواف ئەکەن بە دەوری بتی ( ذي الخلصة ) ( ذِي الْخَلَصَة / بتێک بوو کاتی خۆی تیرەی ( دەوس ) ئەیانپەرست لە سەردەمی جاهیلیەت ) .

وە هەروەها پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ »

واتە : هەرکەسێک دینەکەی خۆی گۆڕی ئەوا بیکوژن .

جا ئەمە دەلالەتە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەسانێک هەنە کە دینی ئیسلام دەگۆڕێت و هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیسلام .

وە لێرەدا تەواوی زانایان ( فصل ) بەشێکیان داناوە لە کتێبە فیقهـ ـیەکان بە ناونیشانی ( کتاب المرتد ) واتە : پەرتووکی هەڵگەڕانەوە لە دینی ئیسلام ، کە تیایدا باسی کۆمەڵێک لە هۆکارەکانی ڕیددەیان کردووە وە باسی ئەو حوکمانەیان کردووە کە لەسەر ئەو پاشگەزبوونەوە لە دینی ئیسلام جێبەجێ دەبێت ، وە هەر لە زمنی ئەو بابەتەش ئەو قسەیەیان هەیە :

( أجمع العلماء على أن من اتخذ وسائط من دون الله يدعوهم ويتوكل عليهم كفر )

واته : کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە هەرکەسێک ( واسطة )ـیەک دابنێ لە شوێنی الله پاشان لەبەریان بپاڕێتەوە و پشت بەوان ببەستێت ئەوا ئەمە کوفرە .

جیاوازی هەیە لەنێوان کافرێکی ئەصلی کاتێک کە دەڵێت : " لا إله إلا الله محمد رسول الله " ئەوا بەم دەربڕینەی دێتە ناو بازنەی ئیسلام وە ئیسلام ـیشی ئەدرێتە پاڵی ، وە لەنێوان ئەو موڕتەدەی کە بەناو خۆی پاڵ ئەدات بۆ ناو دینی ئیسلام ، لەگەڵ ئەمەشدا دەکەوێتە نێو ئەو ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیەی کە لە میلەتی ئیسلام دەریدەکات .

جا لێرەدا ئەگەر ئەو موڕتەدە ویستی کەوا تەوبە بکات ئەوا پێویستە ئەم دوو کارە ئەنجام بدات :

❶ یەکەم : پێویستە کەوا وازبهێنێ لە جۆری کوفرەکە ئەو کوفرەی کە دەریکردووە لە میلەتی ئیسلام ، ئینجا تەوبەشی لێ بکات .

❷ دووەم : پێویستە کەوا جارێکی تر دوو شەهادەکە بهێنێتەوە ، وە لەسەرووی ئەمەش پێویستە کەوا کەسی مورتەد وازبهێنێ لەو ڕیددەیەی کە کەوتووەتە ناویەوە ، تاوەکو سوود وەربگرێت لە بەجێهێنانی دوو شەهادەکە یان غەیری ئەویش لە ئەنجام دانی شیعارەکانی ئیسلام .

بەڵام ئەگەر ئەو مورتەدە هەر بەردەوام بوو لەسەر ڕیددەکەی ، هەروەها لەگەڵ ئەمەش دوو شەهادەکەی دەهێنا بە زمانی ، ئەوا ئەو دوو شەهادەیە بە هەر حاڵێک بێت سوودی پێ ناگەیەنێت ، بۆیە پێویستە کە تەوبە بکات لە جۆری ئەم کوفرەی کە بەهۆیەوە موڕتەد بۆتەوە و هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام .

الشیخ محمد نعیم یاسین دەفەرموێت کە لێدوانێک دەدات لەسەر بابەتی ووتنی دوو شەهادەکە بە زمان :

" وە ئەو کەسەی کە لە پێشدا باسکرا تایبەتە بە کەسێک کە کافر بووە وە لە پێشدا نەهاتووەتە ناو دینی ئیسلام ، بەڵام ئەو کەسەی کە مورتەد بۆتەوە لە دینی ئیسلام ، ئەوا ئەم کەسە حوکم نادرێت بە ئیسلامەتی ، تەنها ئەگەر دانی نا بەو شتەی کە نکۆڵی لێ کردووە لە أموری ئیماندا لەگەڵ ئەوەشدا دوو شەهادەکە بهێنێتەوە.

جا ئەگەر هۆکاری هەڵگەڕانەوەکەی باوەڕ نەبوون و نکۆڵی کردنی تاک و تەنیایی الله تعالی بێت یان نکۆڵی کردنی ئەم پەیامی ئیسلامە بێت ئەوا بەو دووانە بەسیەتی ، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئیلا ئەبێ ئەو دووانە هەبێت با دانیشی پێدابنێت بەو کردەوەی کە ئەو ئینکاری ئەکات ، جا ئەگەر بۆ نموونە نکۆڵی فەرزیەتی زەکاتی دەکرد یان حەڕامیەتی ڕیبای دەکرد یان زینا ، ئەوا ناگەڕێتەوە بۆلای ئیسلامەتیەکەی تاوەکو شاهێدی دەدات بە " لا إله إلا الله وأن محمدًا رسول الله " ، پاشانیش دانبنێت بەو فەرز بوونە ، یان دانبنێت بە حەڕامیەتی ئەو شتەی نکۆڵی لێ کردووە " .

پێویستە کەوا بزانرێت کە الله عز وجل دوو مەرجی داناوە بۆ قبوڵ کردنی تەوبەی موشریکان :

یەکەم : پێویستە کە تەوبە بکەن لەو شیرکەی کە کەوتوونەتە ناویەوە .

دووەم : پێویستە کە پابەندی شەریعەتەکانی ئیسلام بن ، وە ئا ئەمەش هەروەک چۆن الله تعالی لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ } واتە : ئینجا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەجێ هێنا و زەکاتیان دا ئەوە براتانن لە ئاییندا [ سورەتی التوبة : 11 ــ تەفسیری پوختە ]

واتە : ( فإن تابوا من الشرك ) ( جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و تەوبەیان لە شیرک کرد ) جا تەوبە کردنەکەیان لە شیرک بە دەربڕینیانە بۆ ووتنی " لا إله إلا الله " واتە : هیچ پەرستراوایێک بە حەق نییە تەنها الله نەبێت ، وە شوێنکەوتنی پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) وە بە دەربڕینیان بە ووتنی " محمد رسول الله " .

بۆیە کاتێک هیرەقل گەورەی ڕۆمەکان پرسیاری لە أبو سوفیان کرد لەبارەی ئەو کارو کردەوەی کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بانگەوازتان ئەکات بۆلای ، أبو سفیان ـیش گوتی : " يَقُولُ : اعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ، وَاتْرُكُوا مَا يَقُولُ آبَاؤُكُمْ " واتە : ئەو پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) دەڵێت : الله بپەرستن بەتاک و تەنهایی بە هیچ شێوەیەک شەریکی بۆ بڕیار مەدەن ، وە وازبهێنن لەو شتەی کە باوک و باپیرانتان بە ئێوەی ئەڵێن .

هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مَنْ دُونِ اللهِ ، حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ »

واتە : هەرکەسێک ووتی : " لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ " ( هەر ئەوەنە بەس نییە ) ئینجا کافر و بێ باوەڕ بێت بە هەموو ئەو شتەی کە لە شوێنی الله ئەپەرسترێ ، ئەوا ئەو کاتە حەرام دەبێ ماڵەکەی و خوێنەکەی تەنها بە حەق و مافی خۆی نەبێ ، وە حساب و لێپرسینەوەشی لەسەر الله ـیە .

جا لێرەدا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ڕوونی کردەوە کە حەڕامیەتی خوێن و ماڵ لەسەر دوو کار وەستاوە :

① هاتنە قسەیە ( النطق ) بە ووشەی تەوحید و یەک خـودا پەرستی .

② کافر بوون بە هەموو ئەو شتەی کە لە شوێنی الله ئەپەرسترێت .

شتێکی زانراوە و مەعلومە کە هاوەڵان ( الله لێیان ڕازی بێت ) کوشتاری ڕێگرانی زەکاتیان کرد لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ( صلی الله علیه سلم ) وە کوشتاریشیان کردن ( کوشتاری هەڵگەڕاوەکان ــ قتال ردة )

- نموونەشیان وەک ئەو کەسانەیە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد وەک مسیلمةی درۆزن و الأسود و العنسي و سجاح ،

جا کاتێک کە ڕۆیشتن تاوەکو نزیک بوونەوە لە هۆزەکە چاوەڕێی کاتی نوێژیان کرد، جا ئەگەر گوێیان لە بانگ نەبوایە بۆ نوێژ ئەوا هێرش و هەڵمەتیان دەبرد بۆ سەریان، وە ئەگەریش گوێ بیستی بانگ بوونایە ئەوا پرسیاریان لێ ئەکردن لەبارەی بەخشینی زەکات ، لەبەرئەوەی هەڵگەڕانەوەی هەندێکیان بە هۆکاری نکۆڵی کردن بوو لە بەخشینی زەکات نەوەک ئینکاری کردن لە دوو شەهادەکە .

بۆیە کاتێکیش کە پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : « أُمِرْتُ أن أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أن لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وأن مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ، فإذا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الإِسْلاَمِ ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ »

واتە : فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا شایەتی دەدەن کە هیچ خـودایەک نییە جگە لە الله ، موحەممەدیش ڕەوانەکراوی خـودایە ، وە نوێژیش بکەن ، وە زەکاتیش بدەن ، جا ئەگەر ئەو کارەیان کرد ئەوا خوێن و سامانیان لەلای من پارێزراوە ، مەگەر بە حەق و مافی ئیسلام نەبێت ، وە لێپرسینەوەشیان لەلای خـودایە.

∮" بەشی دووەم لە " وانـــــەی سیـانزەیەم ( 13 )∮

هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : « مَنْ مَاتَ وَهْوَ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ نِدًّا دَخَلَ النَّارَ » واتە : هەرکەسێک بمرێت وە لەکاتێکدا هانا و هاواری کردبێتە غەیری الله ، ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە .

جا فەرموودەی یەکەم لە ئاست حەق ـی کافرە ئەصلیەکانەوەیە تا کاتێک کە نکۆڵی لە " لا إله إلا الله " ناکەن ، وە لەکاتێکیشدا فەرموودەی دووەم عام ـە و گشتیە بۆ هەموو کەسێکە کە شیرک و هاوبەش بۆ الله تعالى بڕیار ئەدات .

بەم شێوەیە بۆت ڕۆشن بوویەوە لەگەڵمان کە جیاوازی هەیە لەنێوان موسلمان بوونی کافرێکی ئەصلی ، وە ئەویش بە ووتنی دوو شەهادەکەیە وە دەرخستنی پابەندبوونی بە شەریعەتەکانی ئیسلام ، ئەمەش بە کورتی هەمووی پێی دەوترێت (الإسلام الحكمي) لەلای زانایان ، جا ئەگەر بە تەواوی پابەندی بوو ئەوا پێی دوترێت (إسلام حقيقي) ، وە لەنێوان ( تەوبە کردنی کەسێکی موڕتەد ) چونکە موڕتەد اقرار دەکات و دان دەنێت بە هێنانی دوو شەهادەکە ، بەڵام واتای دوو شەهادەکە هەڵدەوەشێنێتەوە لەکاتی ئەنجامدانی کوفری گەورە ( جا بەهۆی کوفری : بیرو باوەڕی بێت یان ووتە بێت یان کردەوە بێت ) ↩ ( اعتقادًا ، أو قولاً ، أو عملاً ) .

جا ئەمەش پێویستە دەبێت لە تەوبە کردنەکەیدا لە هەمان ئەو کوفرە بێت کە پێی دەرچووە لە میلەتی ئیسلام لەگەڵ ئەوەشدا ووتنی دوو شەهادەکەیە و دەربڕینیەتی ( واتە : دەبێت بێتەوە ناو دینی ئیسلام لە هەمان ئەو دەرگایەی کە بە هۆیەوە لێی دەرچووە ) .

وە بۆت ڕۆشن بوویەوە لەگەڵمان کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەواڵی دا کەوا لە داهاتوویەکی نزیکدا لە ناو ئەم ئوممەتەدا کەسانێک دەبێت کە هەڵدەگەڕێتەوە و پاشگەزدەبێتەوە لە دینی ئیسلام ،

وقد ورد في تفسير قوله تعالى : { إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ * وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا * فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا }

• روى الإمام أحمد عن جابر ( رضي الله عنه ) قال : سمعت رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) يقول : « إِنَّ النَّاسَ دَخَلُوا فِي دِينِ اللهِ أَفْوَاجًا ، وَسَيَخْرُجُونَ مِنْهُ أَفْوَاجًا » .

واتە : وە لە تەفسیری ئەم ووتەیەی الله تعالى ـدا هاتووە کە فەرموویەتی : (کاتێک کە یارمەتی و کۆمەکی خـودا هات لەگەڵ سەرکەوتن ، شاری مەککە ئازاد کرا ★ وە خەڵکت دیی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خـوداوە ★ ئەوسا ئیتر پەروەردگارت بە پاک ڕابگرە بەهۆی ستایشی ـیەوە ، وە داوای لێبوردنی لێ بکە ، چونکە بێگومان ئەو زۆر گیراکەری پەشیمانی یە) [ سورەتی النصر ــ تەفسیری پوختە ]

• جا ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابر ـەوە (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خـودا بوو (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو : «بەڕاستی خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ناو دینی الله ، وە لە داهاتوویەکی نزیکیشدا پۆل پۆل لە دینی الله دەردەچنەوە » .

وە بە شێوەیەکی گشتی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا ، وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا ، فَطُوبىَ لِلْغُرَبَاءِ »

واتە : ئیسلام بە غەریبی و نامۆیی دەستی پێکرد ، وە لە داهاتوویەکی نزیکیش غەریب و نامۆ دەبێتەوە هەروەکو چۆن بە غەریبی دەستی پێ کرد ، جا سەرفرازی و خۆشحاڵی بۆ نامۆکان .

وە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « يُوشِكُ أَن يَكُونَ خَيرَ مَالِ الُمسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الجِبَالِ وَمَوَاقِعَ القَطْرِ ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الفِتَنِ »

واتە : نزیکە بەسەرتان بێت کە باشترین ماڵی موسڵمان کۆمەڵێ مەڕ و ماڵات بێت لە قەدی چیاکان خەریکی لەوەڕاندن بێت ، هەڵبێیت لە ترسی لە دەستدانی دینەکەت بەهۆی زۆربوونی فیتنە و بەڵا .

جا ئەم دوو فەرموودەیە و جگە لەمانەش لە فەرموودەی تر هەمان ئەو مانایەی پێشووتر دووپات دەکەنەوە ، چونکە غوربەت و نامۆیەتی بۆ ئیسلام ناگەڕێتەوە تەنها ئەو کاتە نەبێت کە زۆرێک لە خەڵکی بێ وەفا دەبن و پەیمان شکێنی دەکەن لە دینەکەی الله سبحانە وتعالی وە هەروەها بڵاوبوونەوەی جەهل و نەفامی و کەم بوونی

عیلم و زانستی شەرعی، جا لێرەدا واجبە لەسەر هەموو پیاو و ئافرەتێکی موسڵمان کە فریو نەخوات و هەڵنەخەڵەتێت بەهۆی زۆری بە هیلاک چوان و نامۆیەتی دین و بڵاوبوونەوەی شیرک و فەسادی بە هەموو جۆرە شێواز و وێنەیەک لە نێو ئەم کۆمەڵگایانەدا .

## ∮ وانـەی چــواردەیـەم ( 14 ) ∮

⑨ وە با ئاوڕێک بدەینەوە و سەرنجی خوێنەر ڕابکێشین بۆ یەکەم جار لە دەرکەوتنی ئەو کردەوە شیرکیانە وە درووست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان کە دەستی پێ کرد : لەسەر دەستی کەسانێک بوو ــ کە پێیان دەوترا ــ ( فاطمیەکان )

وە هەروەها ئەو کۆمەڵەیە بەپێی لێکۆڵینەوەکان لە نەوەی مەجوسیەکانن ( ئاگر پەرستەکان ) ئەو کەسانەن کە ئیسلامەتی دەردەخەن لە ڕووکەشدا وە مەبەستێکی فێڵ و کەید ـیان پێی هەیە لە ناخ و باطن ـدا ، وە بنچینەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ( بني عبيد القدّاح ) .

وە هەروەها لە وولاتی مەغریب دەرکەوتن لە ناوەڕاستی هۆزەکانی " كتامة البربرية " ، وە لەم کاتەدا قەناعەتیان هات بە بانگەشە نامۆکەیان ، وە توانیان دەوڵەتێک دابمەزرێنن لەم شوێنەدا .

پاشان توانیان سەرکەون لە جەنگی میصر لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسی دووەم ، وە پاشان درووشمی " الفاطمية " ـیان بەرز کردەوە ، وەک خۆ دانە پاڵ بۆ لای " فاطمة " ( الله لێی ڕازی بێت ) بەڵام بەڕاستی ئەو بەرییە لەوان .

پاشان دەستیان کرد بە بینا کردن و درووست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان.

وە هەروەها بیدعەی زۆریان سەرهەڵدا :

- وە بە ئاشکرا جنێویان بە هاوەڵان دەدا.

- وە ساڵنامە ( التقویم ) ـی کۆچیان هەڵوەشاندەوە.

- وە میراث ـی ئافرەتیان کردە هاوشێوەی میراث ـی پیاو.

- وە زۆربەی ئەمیرەکانیان لە یەهود و الأرمن النصاری بەکار دەهێنا ، جا ( میشا ) یەهودی بوو کردبوویانە ئەمیر بەسەر موسلمانانەوە ، وە ( نسطورس ) نەصرانی بوو یەکێکی تر بوو لە ئەمیرەکان.

- وە دوژمنایەتی ئەهلی سوننەیان دەکرد.

- وە زیاتر لە سێ هەزار لە زانایانی مالیکی ـیان کوشت لە مەغریب ، لەبەرئەوەی ئەو زانایانە ڕەتیان دەکردەوە کە اعتراف بکەن و دان بنێن بە ئیسلامەتیەکەی ئەوان.

تاوەکو جگە لەوانەش زۆر لە خراپە و تاوان و فەسادی گەورەیان هەیە کە لە کتێبە مێژوویەکان نوسراوەتەوە .

جا ئەوان یەکەم کەس بوون کە مزگەوتیان درووست کرد لەسەر گۆڕەکان ، وە دەیانگووت : ئەولیاء ـەکان عیبادەت لەسەریان نەماوە ، وە کەسی وەلی لە مەقام و پلەدا بەرزترە لە پێغەمبەر.

- تەنانەت یەکێک لەوان دەڵێت :

- مقام النبوة في برزخٍ *** فُوَيق الرسول ودون الولي

واتە : مەقام و پێگەی پێغەمبەرایەتی لە ژیانی بەرزەخدا ( واتە : لەناو گۆڕدا ) *** لە سەرووی نێردراوانە وە لە خوارووی وەلیەکانە.

جا وایان داناوە و باوەڕیان وایە کە مەقام و پلەی وەلییایەتی بەرزترە لە مەقامی پێغەمبەرایەتی ، وە بەڕاستی مزگەوتی زۆریان بینا کرد و درووست کرد لەسەر گۆڕەکان .

وە " دار الحكمة " ـیان درووست کرد لە شەقامی " القصر العيني " کە دەرسیان تێیدا دەخوێند و ڕێنماییەکانی " الباطنية "ـەیان تێیدا دەگوتەوە.

وە هەر لەسەر دەستی ئەمانە و هاوشێوەکانیان فرقەی صۆفی سەریهەڵدا وە درووست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان بڵاوبوویەوە وە شیرکیش بە جۆرەها شێوازی زۆر دەرکەوت.

وە سەرەڕای ئەوەی کە صلاح الدين خیلافەتی الفاطمية ـی هەڵوەشاندەوە ، وە دووبارە زۆرێک لەو جێگایانەی بۆ ئەهلی سوننە گەڕاندەوە لە خاکی میصر و شام ، بەڵام مەگەر ئەم بیدعانە نەبێ کە تێکەڵ بە خەڵکی ببوو وە ئەم پاشاوانەش کە لە دوایانەوە مابوویەوە ، وە مایەوەش تاوەکو ئێستا.

جا ئەگەر مرۆڤی موسلمان ئەمەی زانی و عیلمی پێی هەبوو ، ئەوا تێدەگات کەوا دامەزرانی ئەم شیرکیاتانە لەسەر دەستی خەڵکانێکی خبیث و پیس بووە ، کە دەیانەوێت فڕو فێڵ و هەڵخەڵەتاندن بکەن لە عەقیدەی موسلمانان لەژێر درووشمی خۆشەویستی بۆ أهل البیت و ئەولیاء و پیاوچاکەکان ، بە چەواشە کردنی لەسەر خەڵکی ( دەیانەوێت خەڵکی تووشی شیرک بکەن ) ، بۆیە داوا لە الله دەکەین کە باطل و ناحەق لابەرێت و لەناو ببات وە حەقیش ڕۆشن بکاتەوە و دەریبخات .

∮ وانـەی پـانـزەیـەم ( 15 ) ∮

⑩ ئەگەر کەسێک هاتوو گوتی : بەڕاستی زانایانێکی زۆر هەنە بە درووستی دادەنێن بینا کردن و درووست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان ، وە هەروەها بە درووستی دادەنێن نوێژ کردن لەم مزگەوتانەی کە گۆڕی تێدایە.

جا وەڵامی ئەمانە چییە ؟!

بە یارمەتی الله تعالی دەڵێین وەڵام ئەمانەی خوارەوەیە :

شتێکی زانراوە و مەعلومە بۆ هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت کەوا ئەگەر خیلاف و ڕا جیاوازی ڕوویدا لەنێوان زانایان یان ئەگەر موسڵمانان لە بابەتێکدا ڕا جیاواز بوون ، ئەوا واجبە گەڕاندنەوەی ئەو ڕا جیاوازیە بۆ کتێبەکەی الله تعالی وە بۆ سوننەتە صەحیحەکانی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیە وسلم ) بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەم خیلافە.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً } واتە : جا ئەگەر دوو بەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خـودا و پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خـودا و بە ڕۆژی دوایی ئەوە باشترە وە ئاکام و ئەنجامی چاکترە [ سورەتی النساء : 59 ــ تەفسیری پوختە ]

بەڵكو با بچینە خزمەت كۆمەڵێک لە ووتەی پێشەوایانی سەلەف كە تێیدا ئەم حەقیقەتە دووپات دەكەنەوە لە گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت لەكاتی إختلاف و ناكۆكیدا ، جا لەوانیش :

① عن أبي حنيفة ( رحمه الله ) قال :

إذا صَحَّ الحديث فهو مذهبي .

وقال أيضًا :

إذا قلت قولاً يخالف كتاب الله تعالى وخبر الرسول ( صلى الله عليه وسلم ) فاتركوا قولي .

واتە : أبو حەنیفە ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

هەركاتێک فەرموودەی صەحیح و ڕاست پێتان گەیشت ئەوا ئەویان مەزهەبەكەی منە.

وە هەروەها دەفەرموێت : هەركاتێک قسەیەكم كرد كە ئەم قسەیەم پێچەوانەی كتێبەكەی الله تعالی وە هەواڵی ( فەرموودەی ) پێغەمبەر بوو ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوكاتە واز لە قسەكەی من بهێنن .

② وعن الإمام مالك ( رحمه الله ) قال :

إنما أنا بشر أُخطئ وأصيب فانظروا في رأيي فكل ما وافق الكتاب والسنة فخذوه وكل ما لم يوافق الكتاب والسنة فاتركوه.

وقال أيضًا :

ليس أحد بعد النبي ( صلى الله عليه وسلم ) إلا يؤخذ من قوله ويترك إلا النبي (صلى الله عليه وسلم ) .

واته : ئیمامی مالک ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

بەڕاستی منیش مرۆڤم بۆیە هەڵە دەکەم و دەشپێکم ، وە بڕواننە وتە و ڕاکانم ، جا هەرچی کۆک و هاودەنگ بوو لەگەڵ قورئان و سوننەت ئەوە وەری بگرن ، وە هەرچیەکیشی کۆک و هاودەنگ نەبوو لەگەڵ قورئان و سوننەت ئەوا وازی لێ بهێنن.

وە هەروەها دەفەرموێت : لە دوای پێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) هیچ کەسێک نییە ئیللا قسەکەی لێی وەردەگیرێت وە هەروەها لێی ڕەت دەکرێتەوەش ، تەنها پێغەمبەر نەبێت ( صلى الله عليه وسلم ) .

③ وعن الشافعي ( رحمه الله ) قال :

ما من أحد إلا وتذهب عليه سنة رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) وتَعْزُب عنه ، فمهما قلت من قول ، أو أصَّلت من أصل فيه عن رسول الله خلافُ ما قلتُ ، فالقول ما قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) وهو قولي .

وقال أيضًا : أجمع المسلمون على أن من استبان له سنة عن رسول الله لم يحل له أن يدعها لقول أحد .

واتە : ئیمامی شافعی ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

هیچ کەسێک نییە ئیللا سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلى الله علیه وسلم ) لێی دەڕوات و لێی وون و شاراوە دەبێت ، بۆیە من هەر قسەیەکم ووت یاخود هەر بنەمایەکم دامەزراند کە فەرموودە لە پێغەمبەری خـوداوە ( صلى الله علیه وسلم ) هەبوو پێچەوانەی ووتەکەی من ، ئەوا وتەی پێغەمبەری خـودا (صلى الله علیه وسلم) ئەو وەربگرن وە ئەویش ووتەی منە .

وە هەروەها دەفەرموێت : موسوڵمانان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک سوننەتێکی بۆ ڕوون بوویەوە لە پێغەمبەری خـوداوە ( صلى الله علیه وسلم ) ئەوا حەڵاڵ نییە بۆی وازی لێبێنێت لەبەر قسەی هیچ کەسێک .

وقال : إذا وجدتم في كتابي خلاف سنة رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) فقولوا بسنة رسول الله صلى الله عليه وسلم ودعوا ما قلت .

وقال : إذا صَحَّ الحديث فهو مذهبي .

واتە : هەر ئیمامی شافعی دەفەرموێت : ئەگەر شتێکتان بینی لە کتێبەکەمدا پێچەوانەی سوننەت بوو ئەوا بە سوننەتەکەی رسول الله ( صلى الله علیه وسلم ) ئیش بکەن وە قسەکەی من واز لێ بهێنن .

وە هەروەها دەفەرموێت : هەرکاتێک فەرموودەی صەحیح و ڕاست پێتان گەیشت ئەوا ئەویان مەزهەبەکەی منە.

④ قال أحمد بن حنبل ( رحمه الله ) :

لا تقلدني ولا تقلد مالكًا ولا الشافعي ولا الأوزاعي ولا الثوري وخذ من حيث أخذوا .

وقال أيضًا : من رد حديث رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) فهو على شفا هلكة .

واتە : ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

نە تەقلید و لاسایی من بکەوە ، وە نە لاسایی مالک بکەوە ، وە نە شافعی ، وە نە ئەوزاعی ، وە نە ثەوری ـیش ، بەڵکو لەو شوێنەوە وەری بگرن کە ئەوان لێیان وەرگرتووە .

وە هەروەها دەفەرموێت : هەرکەسێک فەرموودەیەکی پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) رەتبکاتەوە و وەرینەگرێ ، ئەوا ئەم کەسە لەسەر لێواری لەناوچووندایە.

جا بۆ هیچ کەسێک درووست نییە کە واز بهێنێت لە بەڵگەیەکی صەحیح و ڕاست و درووست لە قورئان و سوننەت لەبەر قسەی هیچ کەسێک ، جا ئەم کەسە لە هەر پلەو پایەو مەکانەتێکدا بێت ، وە هەروەها چاک بزانە کە ئەو فەرموودانەی رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) کە تێیدا ڕێگری دەکات و نەهی دەکات لە درووست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان ، ئەوا ئەم فەرموودانە گەیشتووەتە حەددی متواتری مانا (التواتر المعنوي)، هەروەکو چۆن ئیمامی " القرطبي " وای فەرمووە لە تەفسیری ئایەتی ( 104 ) ـی سورەتی ( البقرة ) .

∮ وانـەی شـانـەیـەم ( 16 ) ∮

لە کۆتاییدا ئەوەی ماوەتەوە ئەوەیە کە بڵێین :

(1) ئەو موسلمانەی کە بەدوای حەق دەگەڕێت وە بەدوای نەجات و ڕزگاربوون دەگەڕێت لە ئاخیرەتدا ، جا لێرەدا با ئەو کەسە بگەڕێت بەدوای حەق ـدا ، ئەگەر چی زۆربەی خەڵکی دژی بوو وە پێچەوانەی دەکرد .

وە هەروەها الله تعالى ڕاستی فەرمووە کاتێک کەوا دەفەرموێت : {وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ و إِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ}

واتە : وە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت لەسەر زەویدان لە ڕێگەی خـودا گومڕات دەکەن ، ئەوان هەر شوێنی گومان کەوتوون وە هەمیشە درۆ و گۆترەکاری دەکەن [ سورەتی الأنعام : 116 ــ تەفسیری پوختە ]

بەڵام ئەهلی حەق شوێنی هیچ شتێک ناکەون تەنها دەلیل و بەڵگەی دیار و ئاشکرا نەبێت ، هەتاوەکو دڵنیا دەبنەوە لەو مەبەستەی کە الله سبحانە وتعالى هەیەتی ، وە بەدڵنیاییەوە ئەوەشی کە بەندایەتی پێی دەکەن و عیبادەتی پێ دەکەن بریتییە لە حەق و ڕاستی .

هەروەکو چۆن وتراوە : " اعرف الحق تعرف أهله " واتە : حەق بناسە شوێنکەوتووانی حەق دەناسیت .

② جا لێرەدا شوبهە و گومانێکی زۆر ماوە کە نەمانخستنە ڕوو و باسمان نەکرد بۆ ئەوەی وەڵامیان بدەینەوە تاوەکو بابەتەکەمان زۆر لێ درێژ نەبێتەوە ، وە بەو ئومێدەی بتوانین لە جارێکی تردا وەڵامیان بدەینەوە " بإذن الله " ،

بەڵام بۆ زیاتر خوێندنەوە لەسەر ئەم بابەتە پێویستە بچینە خزمەت ئەم کتێبانە :

- ( فتح المجيد شرح كتاب التوحيد )ـی " عبد الرحمن بن حسن آل الشيخ "

- وە کتێبی ( تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد )ـی " الألباني "

- وە کتێبی ( معارج القبول )ـی " الحافظ بن حكمي "

کە لەو بارەیەوە تەفصیل و ڕوونکردنەوەی زیاتریان تێدایە وە هەروەها وەڵامی زیاتریان تێدایە لەسەر گومانەکان " بإذن الله تعالى " .

③ لەسەر هەموو پیاو و ئافرەتێکی موسڵمانە کە بانگەوازی بۆ حەق بکات ، چونکە الله سبحانه وتعالى واجبی کردووە لەسەرمان کە دەعوە و بانگەوازی بکەین بۆ دینەکەی .

الله تعالى دەفەرموێت : { كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ } واتە : ( بەڕاستی ) ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە ( بۆ سوودی ) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە ، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بە خـودا دەهێنن.

[ سورەتی آل عمران : 110 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « الدَّالُّ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ »

واتە : ڕێنیشاندەر بۆ چاکە پاداشتی وەک ئەو کەسە وایە کە چاکەکە دەکات .

وە هەروەها رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى ، كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شيئًا »

واتە : هەرکەسێک بانگەوازی بکات بۆ دینی خـودا و خەڵکی هیدایەت بدرێت ، ئەوا چەند کەس بەهۆی ئەمەوە هیدایەت بدرێت هەمان پاداشتی ئەوانی هەیە بەبێ ئەوەی لە پاداشتی کەسیان کەم بێتەوە .

وە حەقە لەسەر هەموو موسلمانێک کە دەعوە و بانگەوازی بکەن هەروەکو چۆن رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) بانگەوازی کرد .

داوا لە الله دەکەین کە لەو کەسانە بین کە گوێ بۆ قسە و گوفتار دەگرن ئینجا پەیڕەوی چاکترینی دەکەن .

آمین ...

∯ بـەشی یەکەم لە : وانەی حەڤدەیەم ( 17 ) ∯

- وەرزی دووەم : بە تاک دانانی الله تعالى لە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەرام کردن.

[الفصل الثاني : إفراد الله بالتشريع والتحليل والتحريم]

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله ، والصلاة والسلام على رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ومن والاه ، وبعد:

بەڕاستی لەگەڵمان بۆت ڕوون بوویەوە کە ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی درووشمەکان و خـودا پەرستیەکان " لە نوێژ کردن یان دوعا کردن و پاڕانەوە یان سەربڕینی ئاژەڵ یان وەفا کردن بە نەزر یان تەواف کردن یان پەنا بۆ بردن و هاناو هاوار هەتاوەکو لە غەیری ئەمانەش لە هەر جۆرە عیبادەتێک " بۆ غەیری الله تعالى ئەنجام بدرێت ئەوا هاوبەش بڕیاردانی گەورەیە ( شرك أكبر ) ئەو شیرکەیە کە مرۆڤ لە میلەتی ئیسلام دەباتە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شیرک بڕیاردان بۆ الله تعالى بە تەنها کورت نەکراوەتەوە لەسەر شیرکی درووشمەکان و خـودا پەرستی ،

بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا دوو ئەمر و کارو کردەوەی تر هەیە کە دەچێتە نێو شیرکی گەورەوە ، ئەم دووەش بریتین لە :

① ( گێڕانەوەی حوکم بۆ غەیری شەرعی الله تعالی وە هەروەها حەڵاڵ کردن و حەڕام کردنی ئەو شتەی ( کە بەهۆیەوە ) پێچەوانەی شەرعی الله تعالی دەکات و دەبێتە هەڵوەشاندنەوەی شەرعی الله تعالی )

② وە ( ( الولاء و النصرة ) خۆشویستن و دۆستایەتی کردن وە یارمەتی و پشتگیری هەبێت بەسەر غەیری دینی الله سبحانە وتعالی ) .

بەڵام ( گێڕانەوەی حوکم بۆ غەیری شەرعی الله تعالی ، وە هەروەها حەڵاڵ کردن و حەڕام کردنی ئەو شتەی ( کە بەهۆیەوە ) پێچەوانەی شەرعی الله تعالی دەکات و دەبێتە هەڵوەشاندنەوەی شەرعی پەروەردگار عز وجل )، جا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی الله سبحانە وتعالی ، ( الحَكم ) ( کە یەکێکە لە ناوەکانی الله ) واتە : ( فەرمانڕەوای دادوەر ، حوکمڕان لە نێوان هەق و بەتاڵ ) وە ( حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ـیش ) هەروەک چۆن الله تعالی دەفەرموێت : {أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ}

واتە : ئاگاداربن و بزانن و ووریا بن کە : هەرچی درووستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ الله تعالی ـیە [ الأعراف : 54 ]

جا هەروەکو چۆن درووستکردن بە تاک و تەنها بۆ الله ـیە ، جا بەم شێوەیەش حوکم و بڕیاردان بە تاک و تەنها هەر بۆ الله تعالی ـیە .

جا هەرکەسێک نازع و ناکۆکی لەگەڵ الله سبحانە وتعالی کرد لە عیبادەت و بەندایەتی بۆ کردنیدا ئەوا ئەم کەسە طاغوتە ، واجبە کەوا کوفر بکرێت پێی .

بەم شێوەیەش جا ئەگەر کەسێک ناکۆکیکار بوو لەگەڵ اللە لە حوکم و یاسادانان ـدا ، ئەوا دەبێتە طاغوتێکی ڕکابەرو ناکۆکیکار لەگەڵ اللە تعالی ـدا لە یەکێک لە تایبەتمەندیەکانیدا " جا واجبە کەوا کوفر بکرێت پێی " .

وە هەروەکو چۆن اللە سبحانە وتعالی دەفەرموێت : { فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا }

واتە : جا هەرکەس بەتەمایە بە خزمەت پەروەردگاری بگات ( لە قیامەتدا ) ئەوە با کردەوەی چاك بکات وەك لە پەرستنی پەروەردگاری ـدا کەس نەکات بە هاوبەشی .

[ سورەتی الکهف : 110 ـ تەفسیری پوختە ]

- جا لێرەدا اللە سبحانە وتعالی نەهی کردووە و ڕێگری کردووە لە بڕیاردانی شیرک بۆی لە عیبادەت و بەندایەتی کردن ـدا .

جا بەڕاستی بەم شێوەیەش اللە سبحانە وتعالی دەفەرموێت : {وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا} واتە : وە خـودایش لە کارو بڕیاری خۆیدا هیچ کەسی نەکردووە بە هاوتاو هاوبەشی خۆی ، بێ شەریك و بێ وەزیرو بێ هاوتایە ، ڕازیش نابێت قسەی ناحەزو نەیارانی بخرێتە پاڵ قسەیەوە [ سورەتی الکهف : 26 ـ تەفسیری ڕامان ]

وە حوکم و بڕیاردان لێرەدا کورت نەکراوەتەوە تەنها بەسەر قەضاء و قەدەری الله وە حوکمی " الكوني " ، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا حوکم و بڕیاردانی الله تەشریع و یاسا دانانیش بۆ مرۆڤ دەگرێتەوە .

وە ئەمەش ڕوون دەبێتەوە کە لەم ئایەتەدا هاتووە : {وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا}

واتە : بێگومان ئەو خـودایە لە کارو فەرمانڕەوایەتیەکەیدا هیچ کەس ناکات بە هاوتاو هاوبەشی خۆی [ تەفسیری ئاسان ]

جا لە قیرائەی إبن عامر هاتووە " کە یەکێکە لە حەوت قیرائەتە موتەواتیرەکانە " بەم شێوەیە هاتووە : { وَلَا تُشْرِكْ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا } کە بە شێواز و صیغەی نەهی هاتووە ،

واتە : هاوبەش بڕیار مەدە ئەی پێغەمبەر یان ئەی دوێندراو کەس مەکە هاوبەشی الله لە حوکمەکەیدا .

وە لە دوای ئەمەشەوە شیرک و هاوبەش بڕیاردان لە حوکم ـدا تەنها نەبەستراوەتەوە بە حوکمی الله لە گەردووندا وە قەضاء و قەدەر ، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا بەستراوەتەوە بە حوکمی تەشریعی و یاسا دانان بە بەڵگەی ئەوەی کە الله تعالى نەهی و ڕێگری کردووە لە هاوەڵ پەیدا کردن بۆی لە حوکم ـدا ، وە بەم شێوەیەش لەگەڵ پێغەمبەرەکەی دواوە ( صلى الله عليه وسلم ).

جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شیرک و هاوبەش بڕیاردان لە حوکم و یاسا دانان پەیدا دەبێت بۆ الله ، هەروەکو چۆن کەوا شیرک و هاوبەش بڕیاردان لە عیبادەت و بەندایەتی کردندا پەیدا دەبێت، جا لێرەدا بەڕاستی الله تعالی ناوی ناوە لە هەموو ئەو کەسانەی کە شتێکی نوێ دادەڕێژێت کە دژ و پێچەوانەی شەرعی الله سبحانە وتعالی ـیە " ناوی لێ ناوە شەریک .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ } واتە : ( ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بە بەرنامەی خـودا ) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەڕانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی خـودا مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت ( حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن ).

[ سورەتی الشوری : 21 ـ تەفسیری ئاسان ] .

∮ بـەشی دووەم لە : وانەی حەڤدەیەم ( 17 ) ∮

جا هەرکەسێک شەرع و یاسای دانا بێ ئەوەی الله تعالی مۆڵەتی دابێت و ڕازی بێت پێی هاوشێوەی دینی الله سبحانه وتعالی ، ئەوا ئەم کەسە خۆی کردووەتە شەریک و هاوبەش ، واجبە لەسەر موسلمانان کە کوفر بکەن پێی .

وە لەبارەی ئەمەشەوە الله تعالی ئەم مانایە دووپات دەکاتەوە کە لەبارەی یەهود و گاورەکان دەفەرموێت : { اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ }

واتە : ( گاور و جوو ) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خـودا [ سورەتی التوبة : 31 ــ تەفسیری ئاسان ]

جا لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هاتووە :

کە عەدی کوڕی حاتەم کەسێکی نەصرانی بوو پاشان بوو بە موسلمان ، جا کاتێک کەوا چوو بۆلای پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) گوێی لێ بوو کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ، جا بە پێغەمبەری خـودای گووت ( صلى الله عليه وسلم ) : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لَسْنَا نَعْبُدُهُمْ ، فَقَالَ : « أَلَيْسَ يُحَرِّمُونَ مَا أَحَلَّ اللهُ فَتُحَرِّمُونُهُ ، ويُحِلُّونَ مَا حَرَّمَ اللهُ فَتَسْتَحِلُّونَهُ ؟ » قال : بَلَى ، قَالَ : « فَتِلْكَ عِبَادَتُهُمْ » .

واتە : ئەی پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست ، پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : " ئایا ئەو شتەی كە الله حەڵاڵی كردبوو ئەوان حەڕامیان نەدەكرد جا ئێوەش بە حەڕامتان ئەزانی ، وە ئەو شتەی الله حەڕامی كردبوو ئەوان حەڵاڵیان نەدەكرد ئێوەش بە حەڵاڵتان ئەزانی ؟ گوتم : بەڵێ ، فەرمووی : " ئا ئەوە بەندایەتی كردن و گوێڕایەڵی كردن و پەرستنیانە " .

جا لێرەدا دەبینیت كە عەدی كاتێك گوێی لەم ئایەتە بوو { اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ ... } سەری سوڕما ، وە بە پێغەمبەری گووت (صلی الله علیه وسلم) " ئەی پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست "

وە لەم كاتەدا عەدی وا گومانی برد كە عیبادەت و بەندایەتی تەنها كورت كراوەتەوە بەسەر ئەنجامدانی نوێژ و درووشمەكان بۆ غەیری الله ، بۆیە پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) وەڵامی دایەوە كە : مەبەست لە پەرستنیان : واتە گوێڕایەڵی كردنیان لە حەڕام كردنی ئەو شتەی كە الله حەڵاڵی كردووە ، وە حەڵاڵ كردنی ئەو شتەی كە الله حەڕامی كردووە ، هەروەكو چۆن فەرمووی : (ئایا ئەو شتەی كە الله حەڵاڵی كردبوو ئەوان حەڕامیان نەدەكرد جا ئێوەش بە حەڕامتان ئەزانی ، وە ئەو شتەی الله حەڕامی كردبوو ئەوان حەڵاڵیان نەدەكرد ئێوەش بە حەڵاڵتان ئەزانی ؟) عەدی ـش گووتی : بەڵێ، جا پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : " ئا ئەوە بەندایەتی كردن و گوێڕایەڵی كردن و پەرستنیانە " .

کەواتە حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن لە حەق و مافی الله تعالی ـدایە بە تاک و تەنها ، بۆیە هەرکەسێک نیزاع و ناکۆکی لەگەڵ الله عز وجل کرد لەسەر ئەم حەق و مافە ئەوا ناکۆکی لەگەڵ الله کردووە لە پەرستنیدا ، وە بە تەواوی خۆی کردوەتە شەریک و هاوتای الله تعالی هەروەکو چۆن الله سبحانە وتعالی بەم شێوەیە ناوی لێ ناون (الأحبار والرهبان) أربابًا من دون الله.

وە هەرکەسێک گوێڕایەڵیان بکات لەم حەڵاڵ کردن و حەڕام کردنە ئەوا ئەم کەسانەیان کردووەتە خودا لە شوێنی الله ، لەبەرئەوەی حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن حەقێکە بە پاک و خاوێنی تەنها بۆ الله سبحانە وتعالی ـیە ، جا هەرکەسێک بە خۆی ئەم گوێڕایەڵیەی کرد ئەوا ناکۆکی لەگەڵ الله کردووە لە پەرستنیدا.

جا بۆیە ئێمە ( موسلمانان ) ئاگادار دەکەینەوە لەسەر ئەو شتەی کە پێی دەوترێت ئەنجومەنی گەل ( مجلس الشعب ) یان پەرلەمان ، لە دەستوردا پێی دەوترێت دەستەڵاتی یاسا دانان ( السلطة التشريعية ) کە تێیدا حەق و مافی دەرکردنی یاسایان هەیە.

- بەڵام لە حەقیقەتدا مەجلیس و ئەنجومەنێکی شیرکیە وە ئەندامەکانی هاوبەش بۆ الله دادەنێن و ناکۆکی لەگەڵ الله دەکەن لە پەرستنیدا ، لەبەرئەوەی ئەوان حوکم بە شەرعی الله ناکەن لە زۆرێک لە حوکمەکان ، بەڵکو بەڕاستی ئەم ئەندامانە دەستەڵات دەدەن بە خۆیان وە بە بەرزتری دادەنێن لە بەرامبەر دینی الله تعالی ، کە

ڕایدەگەیەنێت و موڵەت دەدات بەم حوکمە یان بەم یاسایە کەوا حوکمی پێ بکرێت یان کامەیان حوکمی پێ نەکرێت.

وە لەکاتێکدا کە دەڵێن : ئەگەر ئەندامانی ئەنجومەن ئەگەر زۆرینەیان هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی کە شەریعەت حوکمی پێ بکرێت ئەوا واجبە کە کار پێ نەکردن و نەهێشتنی قەوانین و یاساکان بەهۆی هاوڕا بوونی زۆرینە ،

جا ئەمە درۆیە و درۆ دەکەن لە لایەکدا ، وە لە لایەکی تریشدا ئەمە کوفرە ، چونکە ئەم ئەندامانە دەستەڵات و گەورەیی ئەدەن بە خۆیان کە بە بەرزتری دادەنێن لە بەرامبەر دینی الله ، وە هەروەها دینی الله و حوکمەکانی بە خودی خۆی جێبەجێ ناکات ، بەڵکو ئەمان ئیزن و مۆڵەت دەدەن بەمەی کە حوکمی پێ بکرێت یان حوکمی پێ نەکرێت .

وَاللهُ الْمُسْتَعَان ...

## ∮ وانـەی هـەژدەیـەم ( 18 ) ∮

( وەرزی : بە تاک دانانی الله تعالى لە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ) .

لەم بارەیەوە دڵنیا دەبینەوە کەوا لە فەرمووده‌دا هاتووە کە پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بانگ دەکرا بە ( أبا الحكم ) ( واتە : ئەم نازناوە بوو کە پێی بانگ دەکرا ) :

فقال له النبي ( صلى الله عليه وسلم ) : « إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ ، فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ ؟ » فَقَالَ : إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي ، فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ فَرَضِيَ كِلاَ الْفَرِيقَيْنِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) : « مَا أَحْسَنَ هَذَا ، فَمَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ ؟» قَالَ : لِي شُرَيْحٌ ، وَمُسْلِمٌ ، وَعَبْدُ اللَّهِ ، قَالَ : « فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ ؟» قُلْتُ : شُرَيْحٌ ، قَالَ : « فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ ».

واتە : پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) بانگی دەکات و دەفەرموێت : بەڕاستی الله خۆی دادوەرە ، وە حوکمیش هەر بۆ ئەوە ، جا بۆچی بە ( أبا الحكم ) بانگت دەکەن ؟ ئەویش وتی : لەبەر ئەوەی کە عەشیرەتەکەم هەر کاتێک ناکۆکییان ببوایە لەسەر شتێک دەهاتنە لای من کە دادوەرییان لە نێواندا بکەم ، منیش دادوەرییەکەم بۆ دەکردن ئیتر هەر دوو لایەنەکە ڕازی دەبوون ، پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ئای کارێکی چەند باشت کردووە ، ئەی باشە چەند کوڕت هەیە ؟ وتی :

(شریح)ـم هەیە و ( مسلم ) و ( عبدالله ) ، فەرمووی : کامیان گەورەکەیانە ؟ وتی ( شریح ) فەرمووی : کەواتە تۆ ( باوکی شریح ) ـیت .

جا پێغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( بەڕاستی الله خۆی دادوەرە ، وە حوکمیش هەر بۆ ئەوە ).

ئەم سوودەی کە لێی وەردەگیرێت ئەوەیە کە ( الحَکَم ) یەکێکە لە ناوەکانی الله تعالی، بۆیە بۆ هیچ کەسێک درووست نییە کە بەم ناوە بانگ بکرێت ،

وە ئەو ووتەیەی ( وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ ) واتە : ( وە حوکمیش هەر بۆ ئەوە ) ئەو سوودەی لێ وەردەگیرێت کە حوکم و دادوەری تایبەتە بە الله تعالی ، وە بەدڵنیاییەوە گەڕانەوەی حوکمەکان و یاسا دانان واجبە کە بگەڕێندرێتەوە بۆلای الله عز وجل ،

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ }

واتە : وە هەرشتێك کە تێیدا جیاواز بوون ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خـودا دەگەڕێتەوە.

[ سورەتی الشوری : 10 ــ تەفسیری پوختە ]

وە هەروەها الله تعالی دەفەرموێت : { فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً } واتە : خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان دەربارەی حوکمی خـودایی ، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خـودا و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله علیه وسلم ) ( کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت )،

ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خـودا و بە ڕۆژى قيامەت هەيە ، ( ڕەفتار كردنتان ) بەو شێوەيە چاكترين و جوانترين سەرچاوەيە بۆ چارەسەرى كێشەكانتان.

[ سورەتى النساء : 59 ــ تەفسيرى ئاسان ]

جا الله سبحانه وتعالى واجبى كردووە لەكاتى ڕووداوەكان واتە ڕا جياوازى و ناكۆكى كە ئيماندارا ن ئەم ناكۆكيە بگەڕێننەوە بۆلاى الله و پێغەمبەرەكەى ( صلى الله عليه وسلم ) .

وە گەڕانەوەش بۆلاى الله بە گەڕانەوەيە بۆلاى قورئانەكەى ،

وە گەڕانەوەش بۆ پێغەمبەرى خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) بە گەڕانەوەيە بۆلاى لە ژيانيدا ، وە بۆ سوننەتەكەى لەدواى وەفاتيدا .

وە مەبەست لەوەى پێشووتر : ڕوونكردنەوەى ئەوەى كە ( الحُكم ) لە تايبەتمەنديەكانى الله سبحانه وتعالى ــيە ، بۆيە هەركەسێك نيزاع و ناكۆكى تێيدا كرد ئەوا دەبێتە طاغوت واجبە كوفر كردن پێى .

وە هەروەها لەوەى دڵنيا بێتەوە لەمەش ئەوا الله تعالى دەفەرموێت :

{ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ } واتە : بەڕاستى حوكم و فەرمانڕەوايى جگە لە خـودا شايستەى كەسى تر نييە ، فەرمانيشى داوە جگە لە خۆى كەسى تر نەپەرستن [ سورەتى يوسف : 40 ــ تەفسيرى ئاسان ].

جا لەم ئایەتەدا الله سبحانه وتعالی باسی کردووە بە صیغەی " الحصر " و " القصر " بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە ( الحکم ) واتە : فەرمان و دادوەری حەقێکە کە بە پاک و خاوێنی تەنها بۆ الله سبحانه وتعالی ـیە ، جا هەرکەسێک ناکۆکی کرد تێیدا ئەوا ناکۆکیکارە لە تایبەتمەندیەک لە تایبەتمەندیەکانی الله ، بەم کارەشی دەبێتە پێشەوایەک لە پێشەوایانی کوفر .

وە لەم بارەوەش الله تعالی فەرموویەتی :

{أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا * وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا} واتە : ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ ( کە قورئانە ) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە ( کە تەوراتە ) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خـودا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی ★ وە ئەگەر پێیان بوترێ : وەرن بۆ لای ئەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ، وە بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم )) دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگەڕانێکی تەواو.

[ سورەتی النساء : 60 , 61 ـ تەفسیری پوختە ]

پێشەوا و موفەسیر إبن کەثیر ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

ئەمە ئینکاری و نکۆڵی کردنێکە لەلایەن الله عز وجل لەسەر هەرکەسێک کە بانگەشەی ئیمان هێنان دەکات بەوەی کە الله بۆ سەر پێغەمبەرەکەی دابەزاندووە وە بەوەیشی کە بەسەر پێغەمبەرانی پێشووتر دابەزیوە.

- بەڵام ئەم کەسە لەگەڵ ئەم بانگەشەیە دەیەوێت کە بۆ بڕینەوەی داواو کێشەکانی حوکم بەرێتەوە بۆ غەیری کتێبەکەی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی.

- هەروەکو چۆن لە هۆکاری دابەزینی ( سبب نزول )ـی ئەم ئایەتە باسکراوە کە کەسێکی ئەنصار لەگەڵ کەسێکی یەهودی چوون بە گژ یەکدا کێشە کەوتە نێوانیان ، جا یەهودیەکە ووتی : بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان من و تۆ دەچینە لای موحەممەد ، ئەنصاریەکەش ووتی : بۆ کێشەکەی نێوان من و تۆ با بچینە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف.

وە ووتراوە : ئەم ئایەتە لەسەر کۆمەڵێک لە مونافیق و دوو ڕووەکان دابەزیوە ئەوانەی کە وا نیشان دەدەن موسلمانن و ئیسلامەتی دەردەخەن ، بەڵام دەیانویست بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان بچن بۆلای کاربەدەستانی سەردەمی جاهیلیەت ، وە جگە لەمەش شتی تریش ووتراوە ، وە ئەم ئایەتە گشتگیرە ، هەموو کەسێک ئەگرێتەوە کە حوکم نەکات بە قورئان و سوننەت ، الله تعالی زەمی ئەو کەسانە دەکات کە لە قورئان و سوننەت لادەدەن ، وە حوکم دەگێڕنەوە بۆ حوکمە باطل ـەکان.

- وه مه‌به‌ست له طاغوت ئا ئه‌مه‌یه ، له‌به‌ر ئه‌مه الله تعالی ده‌فه‌رموێت : { يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ } واته : ده‌یانه‌وێت که حوکم بگێڕنه‌وه بۆلای طاغوت .

تاوه‌کو کۆتایی .

-وه الله تعالی فه‌رمووی : { يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا } واته : ڕووت لێ وه‌رده‌گێڕن به وه‌رگه‌ڕانێکی ته‌واو.

- ( إبن كثير ده‌ڵێت : ) واته : زۆر به توندی ڕوویان له تۆ وه‌رده‌گێڕن ، خۆ به زل زانیان ڕێیان پێنادا بێن، هه‌روه‌کو چۆن الله تعالی له‌باره‌ی موشریکه‌کانه‌وه ده‌فه‌رموێت : { وَإِذا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أنزل اللَّهُ قالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنا عَلَيْهِ آباءَنا }

واته : وه کاتێ پێیان بووترێ شوێن ئه‌و ( ئایینه ) بکه‌ون خـودا ناردوویه‌تییه خواره‌وه ، ده‌ڵێن نه‌خێر به‌ڵکو ئێمه شوێن ئه‌و ( ئایینه ) ده‌که‌وین که باوو باپیرانمان له‌سه‌ری بوون [ سوره‌تی لقمان : 21 ــ ته‌فسیری پوخته ]

- ئا ئه‌مانه به پێچه‌وانه‌ی ئیماندار‌ه‌کانن ، ئه‌وانه‌ی که الله له‌باره‌یانه‌وه ده‌فه‌رموێت :

{إِنَّما كانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنا وَأَطَعْنا}

واته : قسەی ئیمانداران تەنها ئەمەیە کاتێ بانگ بکرێن بۆ لای ( بەرنامەی ) خـودا و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەوەی بڕیار بدات لە نێوانیاندا کە دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵین [ سورەتی النور : 51 ـ تەفسیری پوختە ] " .

∮ وانــەی نــۆزدەیـەم ( 19 ) ∮

الله تعالى دەفەرموێت : { أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا * وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا }

واتە : ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ ( کە قورئانە ) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە ( کە تەوراتە ) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خـودا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی ★ وە ئەگەر پێیان بوترێ : وەرن بۆ لای ئەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ، وە بۆ لای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگەڕانێکی تەواو

[ سورەتی النساء : 60 , 61 ــ تەفسیری پوختە ]

الله عز وجل لەم ئایەتەدا باسی دوو جۆر لە خەڵکی کردووە :

① جۆری یەکەم : بریتین لەم کەسانەی کە دەیانەوێت حوکم بگێڕنەوە بۆ غەیری کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ، جا ئەم کەسانە ئیماندار نینە .

② جۆری دووەم : بریتیە لەو کەسەی کە حوکم بۆلای دەگەڕێندرێتەوە : کە ئەویش طاغوتە .

بەڵام جۆری یەکەم : ( ئەم کەسەیە کە دەیەوێت حوکم بباتەوە بۆ غەیری قورئان و سوننەت ) .

جا الله تعالی ناوی لە ئیمانەکەیان ناوە بە بانگەشە کردن و ڕواڵەت ، هەروەکو چۆن الله تعالی فەرمووی : { أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ }

واتە : ئەرێ ئەوانەت نەدیوە وا دەڵێن باوەڕیان بەو بەرنامەو قورئانەیە دابەزێنراوە بۆت هەیە ، وە بەو پەیامەش پێش تۆ دابەزێنراوە باوەڕ دەکەن ، دەیانەوێ بۆ بڕینەوەی داواو کێشەکانیان بچنە لای طاغووت و بەرنامە شەیتانییەکان ؟!

[ سورەتی النساء : 60 ــ تەفسیری ڕامان ]

وە هەروەها بە ڕاشکاوانە ناوی مونافیقی لێ نان لەدوای ئەم ئایەتە ، هەروەکو چۆن دەفەرموێت : {وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا }

واتە : وە ئەگەر پێیان بوترێ : وەرن بۆ لای ئەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ، وە بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم )) دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگەڕانێکی تەواو .

[ سورەتی النساء : 61 ــ تەفسیری پوختە ]

جا ئەم کەسانە ( ئەوانەی حوکم دەگێڕنەوە بۆ غەیری قورئان و سوننەت ) جگە لەوەی ئیماندار نین بەڵکو تایبەتمەندیەکی گەورەی نیفاق و دوو ڕوویان تێدایە .

- وە شتێکی زانراوە کە هەرکەسێک نیشانەیەک لە نیشانەکانی نیفاق و دوو ڕوویی گەورە لەسەری سەرهەڵبدات لەدوای سەردەمی پێغەمبەرایەتی ، ئەوا ئەم کەسە پێی دەوترێت مورتەد نەوەک مونافیق .

هەروەکو چۆن حوذەیفەی کوڕی یەمان ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت :

« إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) ، فَأَمَّا اليَوْمَ فَإِنَّمَا هُوَ الكُفْرُ بَعْدَ الإِيمَانِ » .

واتە : بێگومان نیفاق و دوو ڕوویی لەسەردەمی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) مونافیق و دوو ڕوویی بووە ، بەڵام نیفاقی ئەمڕۆکە بریتییە لە کوفر و بێ باوەڕی لەدوای ئیمان هێنان .

ئەمەش لە ئاست کارو باری ئەو کەسانەیە کە حوکم و دادوەری دەبەنەوە بۆ غەیری قورئان و سوننەت .

بەڵام جۆری دووەم : ئەوەی کە ( حوکمی بۆلای دەگەڕێندرێتەوە لە غەیری قورئان و سوننەت ) .

ئەمە ئەویان طاغوتە وەک لە ئایەتەکەدا باسکراوە : { يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ } واتە : دەیانەوێت کە حوکم و دادوەری ببەنەوە بۆلای طاغوت .

طاغوت : بریتییە لە هەموو ئەو شتەی کە لە شوێنی الله دەپەرسترێت وە ئەویش پێی ڕازیە.

وە هەروەها ئەویش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ناکۆکی لەگەڵ الله عز وجل دەکات لە تایبەتمەندیەک لە تایبەتمەندیەکانی.

جا لێرەدا ئەو کەسەی کە بەرنامە و یاسا و قانونێک بۆ خەڵکی دادەڕێژێت کە دژ و پێچەوانەی شەرعی الله سبحانه وتعالی ـیە ، ئەم کەسە طاغوت و کافرە ، واجبە کەوا کوفر بکرێت پێی.

وە ئەو کەسەشی کە حوکم و دادوەری بەم یاسا و قانونە دەکات لە دادوەر ( قاضي ) وە هاوشێوەی ئەو ، هەروەها ئەویش کافرە.

لەبەرئەوەی ووتەکەی الله تعالی عموم ـیە و گشتیە کە دەفەرموێت : { وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ } واتە : وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێ باوەڕن و موسوڵمان نین.

[ سورەتی المائدة : 44 ـ تەفسیری پوختە ]

بەڵکو بۆ ئەم بابەتە با بچینە خزمەت ئەم ئایەتە کە الله عز وجل دەفەرموێت : { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ } واتە : ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن ؟ ئایا کێ حوکم و بڕیاری لە هی خـودا جوان و چاکترە ؟ لای کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە [ سورەتی المائدة : 50 ـ تەفسیری پوختە ]

جا لێرەدا ئیمامی إبن کەثیر ( رەحمەتی الله لێی بێت ) فەرموویەتی :

- الله تعالی پێناخۆشی خۆی دەردەبڕێ و نکۆڵی دەکات دەربارەی ئەو کەسانەی کە لە حوکم و فەرمانی پتەوی الله تعالی دەردەچن ، کە هەموو کارێکی چاکە لەخۆی دەگرێت ، وە ڕێگرە لە هەموو کارێکی خراپە ، وە لایداوە لە هەموو هەواو ئارەزوو و زاراوەیەک کە کەسانێک داینابێ کە بەڵگەیەکی شەرعیان بە دەستەوە نەبێ لەلایەن خـوداوە.

- هەروەکو چۆن خەڵکی سەردەمی نەفامی دادوەریان بەم گومڕاییی و کارە نەفامانانیە دەکرد کە بە ڕاو بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆیان دایاننابوو ، وە هەروەها هەروەکو چۆن تەتارەکان حوکمیان پێ کردووە لە سیاسەتی پاشایەتیدا بە فەرمانی پاشاکەیان جەنگیز خان کە یاسق ـی بۆ دانابوون ، کە پێکهاتبوو لە کتێبێک لە کۆمەڵێک بڕیار کە لە چەندین یاسا و ڕێسا کۆی کردبووەوە و دایینابوو ، لە ئاینی یەهودی و و گاور و ئاینی ئیسلام و ئاینی تریش ، وە فەرمان و بڕیاری زۆری تێدا بوو کە تەنیا بە هەواو ئارەزووی خۆی دایینابوو ، پاش خۆی لەناو کوڕەکانیدا کرابوو بە یاسا و ڕێسایە کە پێشیان دەخست بەسەر فەرمانی الله و سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ).

- جا هەرکەسێک لەوان ئەم کارەی کرد ئەوا کافرە واجبە کوشتارکردن و شەڕکردن لەگەڵی تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکم و بڕیاری الله و پێغەمبەرەکەی ، چونکە هیچ حوکمێک جگە لە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) قبوڵ ناکرێت کەم بێت یان زۆر بێت ،

- الله تعالی دەفەرموێت : { أَفَحُكْمَ الْجاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ } أَيْ : يَبْتَغُونَ وَيُرِيدُونَ ، وَعَنْ حُكْمِ اللَّهِ يَعْدِلُونَ.

واتە : { ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن }

واتە : داوای حوکمی جاهیلیەت دەکەن و ئەویان دەوێت ، وە لە حوکمی الله تعالی لادەدەن.

- { وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ } واته : ئایا کێ حوکم و بڕیاری له هی خـودا جوان و چاکتره ؟ لای کەسانێك که بڕوای تەواویان هەیه .

واته : وه کێ له الله تعالی دادپەروەرتره له حوکم و بڕیاریدا ، بۆ کەسێک که له شەرعی الله تعالی تێگەیشتبێت و لێی شارەزا بێت ، وه ئیمان و باوەڕی پێی هەبێت ، وه چاک بزانێت و دڵنیا بێت که الله تعالی چاکترین دادگەره ، وه به ڕەحم ـتر و به بەزەییتره بۆ درووستکراوەکانی خۆی له دایک بۆ کوڕەکەی خۆی ، چونکه الله تعالی هەر خۆی زاناو ئاگاداره به هەموو شتێک ، وه به توانایه بەسەر هەموو شتێکدا ، وه له هەموو شتێکیش دادگەرتره .

جا تەفسیری ئەم ئایەتەی که باسکرا ( ئایەتی 50 له سورەتی المائدة ) تەفسیری عەللامه إبن کەثیر بوو ( رەحمەتی الله لێی بێت )، ئەو سوودەی که لێی وەردەگیرێت ئەوەیه که هەرکەسێک حوکم به غەیری کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) بکات ئەوا کافره، بەڵکو لەگەڵ ئەمەش واجبه کوشتار و جەنگ کردن لەگەڵی تاوەکو حوکم به شەرعی الله تعالی دەکات ، حوکم به غەیری قورئان و سوننەت ناکات نه کەم نه زۆر ، وه ئەو سوودەشی لێ وەردەگیرێت که ( الیاسق ) کتێبی ئەم بڕیارانه بوو که پاشای تەتارەکان جەنگیز خان دایڕشتبوو بۆ تەتارەکان ، که پێکهاتبوو له کۆمەڵێک حوکم و بڕیار که وەرگیرابوو له ئاینی یەهودی و گاور و له ئاینی ئیسلامیش لەگەڵ ئەمەشدا چەندین و حوکم و بڕیاری تری دانابوو که تەنها به ڕاو بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆی داینابوو .

∮ وانـەی بـیســـــتەم ( 20 ) ∮

لەم تەفسیرەی کە لە پێشووتردا باسمان کرد ئەوەی کە عەلامە إبن کەثیر ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) فەرمووی : ئەو سوودەی کە لێی وەردەگیرێت ئەوەیە کە هەرکەسێک حوکم بە غەیری کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) بکات ئەوا کافرە ،

بەڵکو لەگەڵ ئەمەش واجبە کوشتار و جەنگ کردن لەگەڵی تاوەکو حوکم بە شەرعی الله تعالی دەکات ، حوکم بە غەیری قورئان و سوننەت ناکات نە کەم نە زۆر ، وە ئەو سوودەشی لێ وەردەگیرێت کە ( الیاسق ) کتێبی ئەم بڕیارانە بوو کە پاشای تەتارەکان جەنگیز خان دایڕشتبوو بۆ تەتارەکان ، کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێک حوکم و بڕیار کە وەرگیرابوو لە ئاینی یەهودی و گاور و لە ئاینی ئیسلامیش لەگەڵ ئەمەشدا چەندین حوکم و بڕیاری تری دانابوو کە تەنها بە ڕاو بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆی دانابوو .

جا کەواتە هەر قانون و یاسایەک کە ئیسلام بە تاک و تەنهایی ناکات بە دادوەر ئەوا " قانونێکی کوفریە " ، " وە دانەر و داڕێژەرەکەی کافرە " " وە ئەو کەسەشی حوکمی پێ دەکات کافرە " ، وە هەروەها ئەم جۆرە حوکمە لێی دوور ناکەوێتەوە بە لەخۆگرتنی هەندێک لە حوکمەکانی ئیسلام .

بەڵکو بۆ ئەم بابەتەش دووبارە دەچینەوە خزمەت الشیخ إبن کثیر کە دەفەرموێت :

- هەر کەسێک وازبهێنێت لەم شەرعە پتەوەی کە دابەزێندراوە بۆ سەر محمدی کوڕی عبدالله ( صلى الله عليه وسلم ) کە کۆتایەمینی پێغەمبەرانە ، وە حوکم بباتەوە بۆ غەیری شەریعەتی ئیسلام لە یاسا نەسخ کراو و هەڵوەشێنراوەکان ، ئەوا کافر بووە ،

- جا حاڵی ئەم کەسە چۆن دەبێت کە حوکم و دادوەری دەباتەوە بۆ " الیاسا " وە بیخاتە پێش شەرعەوە ؟

هەرکەسێک ئەم کارە بکات ئەوا کـــــافر بووە بە یەک دەنگی موسلمانان .

الله تعالى دەفەرموێت : {أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ}

واتە : ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن ؟ ئایا کێ حوکم و بڕیاری لە هی خـودا جوان و چاکترە ؟ لای کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە .

[ سورەتی المائدة : 50 ـ تەفسیری پوختە ]

وە الله تعالى دەفەرموێت : {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا} واتە : نەخێر ( وانییە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن ) سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکییەکی نێوانیان ـدا لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچییەکی تەواو .

[ سورەتی النساء : 65 ـ تەفسیری پوختە ] " صدق الله العظیم "

وە هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بچینەوە بۆ ئەوەی پێشووتر کە باسکرا الله سبحانە وتعالی ناوی نا لە هەموو یاسا دانانێک کە پێچەوانەی شەرعی الله سبحانە وتعالی دەکات " ناوی دینی لێ نا " ،

وە ئەمەشیان هەروەکو چۆن الله تعالی باسی کردووە لە چیرۆکی یوسف ( سەلامی الله لێی بێت ) ، کاتێک کەوا براکانی لە فەڵەستین ـەوە هاتن بۆ میسر بۆ بە دەستهێنانی گەنم لەدوای ئەو گرانی و برسێتیەی کە سەراپای گرتبوویەوە .

وە یوسف ( سەلامی الله لێی بێت ) دەیویست کەوا برایەکەی ( بنیامین ) بمێنێتەوە لەگەڵی لە میسر بۆ ئەم کارەش فێڵێکی کرد.

وە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە ئاو خۆرەکەی لەناو باری برایەکەی دانا هەروەک ئەوەی کە برایەکەی دزیبێتی ، پاشان بانگکەرێکی نارد و بانگی براکانی کرد بەوەی کە ئەوان دزیان کردووە ،

جا ئەوانیش ئەم کارەیان لەخۆیان دوور دەخستەوە و حاشایان لێی دەکرد ، ئینجا پرسیاریان لێ کردن لەبارەی حوکمی دزی کردن لە شەریعەتی ئیبراهیم ( سەلامی الله لێی بێت ) لەبەرئەوەی ئەوان کوڕانی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم ـن ( سەلامی الله لێیان بێت ) ئەوانیش وەڵامیان دانەوە بەوەی کە لە شەریعەتی ئیبراهیم ( سەلامی الله لێی بێت ) دادگایی دەکرێت بەوەی کە کەسی دز دەکرێت بە بەندە لەلای ئەو کەسەی دزی لێ کردووە.

وه له بەرامبەردا یاسایەکی تر هەبوو لەلای پادشای میسر که دادگایی دەکرا به پێ بژاردن ( الغرامة ) و تەمێ کردن بەسەر کەسی دز ـدا ، وه له پاشانیش یوسف ( سەلامی الله لێی بێت ) دەستی کرد به گەڕان و پشکنینی کەل و پەلەکەیان ، وه له سەرەتادا دەستی کرد به پشکنینی کەل و پەلی براکانی خۆی پاشان جامولکه و دەفرەکەی له باری برایەکەی خۆی دەرهێنا ،

وه بەهۆی ئەمەشەوه براکەی برد و کردیه بەنده پەیڕەو و شوێنی شەریعەتەکەی ئیبراهیم کەوت ( سەلامی الله لێی بێت ) ، وه هەروەها لەم حاڵەتەدا یاسای پادشای جێبەجێ نەکرد بەسەر دز ـیەکەدا.

وه لێرەدا الله تعالی دەفەرموێت : {كَذَلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ} واته : ئا بەو جۆره پیلانمان نیشانی یوسف دا ئەو نەیدەتوانی براکەی بگرێ به پێی ئایینی و یاسایی پادشا [ سورەتی یوسف : 76 ـ تەفسیری پوخته ]

واته : یوسف نەیدەتوانی " که یەکێکه له پێغەمبەران " کەوا براکەی خۆی بگرێت لەسەر دینی پادشا.

واته : قانون و یاسای پادشا بەستراوەتەوه به حەدی دزی کردن .

وه شایەت لەم کارەدا دیار و ئاشکرایه که الله تعالی ناوی ناوه له یاسایەک که پێچەوانەی شەرعی الله ـیه : ( دین الملك ).

جا بۆیە بەڕاستی ئەوانەی قانون و یاسا دادەنێن و دادەڕێژن کە پێچەوانەی شەرعی الله ـیە ، ئەوا ئەو کەسانە لە حەقیقەتدا دینێکی نوێ بۆ خەڵکی دادەڕێژن، هەرکەسێک چووە نێوی ئەوا چووەتە نێو دینی پادشا ، وە هەرکەسێکیش دەرچوو لێی ئەوا دەرچووە لە دینی پادشا.

## ∮ وانـەی بـیســـت و یــەک ( 21 ) ∮

جا هەروەکو چۆن ووتمان ، الله سبحانه وتعالى نەفی ئیمانی کردووە لە کەسێک کە حوکم ناباتەوە بۆ ئەو شەرعەی کە دابەزێنراوە بۆ سەر محمد ( صلى الله عليه وسلم ).

کاتێک کەوا الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت : { فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا } واتە : نەخێر (وانییە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن ) سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکییەکی نێوانیان ـدا لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچییەکی تەواو [ سورەتی النساء : 65 ـ تەفسیری پوختە ]

جا ئەمە سوێند خواردنێکە لەلایەن الله تعالى بە گەورەترین سوێند ، کاتێک کەوا سوێند بە خۆی دەخوات سبحانه وتعالى ، { فَلَا وَرَبِّكَ } ( واتە : نەخێر سوێند بە پەروەردگارت ) لەسەر نەفی کردنی ئیمان هێنان ، تاوەکو بە تەواوی حوکم دەبەنەوە بۆ پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) لە هەموو ئەو ناکۆکی و جیاوازیەی نێوان خەڵکی لە کێشەکان یان حوکمەکان .

الشیخ عبد الرحمن ـی کوڕی حسن له کتێبی [ فتح المجید ]ـدا دەفەرموێت :

فمن خالف ما أمر الله به رسوله ( صلى الله عليه وسلم ) بأن حكم بين الناس بغير ما أنزل الله ، أو طلب ذلك اتباعًا لما يهواه ويريده فقد خلع ربقة الإسلام والإيمان من عنقه.

واته : هەرکەسێک پێچەوانەی ئەو فەرمانە بکات کە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) فەرمانیان پێی کردووە بەوەی کە حوکم و دادوەری بکات لە نێوان خەڵکی بە غەیری ئەو قورئانەی کە الله دایبەزاندووە ، یان داوای ئەوە بکات کە هەوا و ئارەزووی دەیەوێت ئەوا ئەو کەسە گرێی ئیسلام و ئیمانی لە گەردەنی کردوەتەوە و دایماڵاندووە .

وە الله سبحانه وتعالی باسی ئەوەی کردووە کە ئیمانداران تەنها یەک قسەیان هەیە و یەک حاڵەتیان هەیە لەکاتی دەرچوونی حوکم و بڕیاری الله و پێغەمبەرەکەی ، ئەویش بریتییە لە : ( السمع والطاعة ) هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ }.

واته : بەڵام گوفتاری ئیمانداران کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای خـودا و پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن : بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع ، هەر ئا ئەوانەشن سەر فرازو سەرکەوتوو .

[ سورەتی النور : 51 ــ تەفسیری ئاسان ]

جا کەواتە ئیماندااران تەنها یەک قسەیان هەیە هەر کاتێک کە بانگ دەکرێن بۆلای الله و پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی حوکم و بڕیار بدات لە نێوانیان ئەوا دەڵێن : ( بیستمان و گوێڕایەڵین )، جا خۆ بەدەستەوە دان و ملکەچ بوون بۆ حوکم و بڕیاری الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ئا ئەوە حاڵی ئیمانداارانە، لەکاتێکدا حاڵی مونافیقەکان بریتییە لە بەرهەڵستی و نارەزایی و پشت هەڵکردن لە حوکمی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) .

هەروەکو چۆن الله تعالی لەبارەی هەڵسوکەوتیان دەفەرموێت : {وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أنزل اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا}

واتە : وە ئەگەر پێیان بوترێ : وەرن بۆ لای ئەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ، وە بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم)) دوو ڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگەڕانێکی تەواو .

[ سورەتی النساء :61 ـ تەفسیری پوختە ]

وە هەروەها الله تعالی لەم ئایەتانەشدا دووبارە لەبارەی حاڵیان دەفەرموێت : { وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُوْلَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ * وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ * وإِنْ يَكُن لَّهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ * أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ارْتَابُوا أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ بَلْ أُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ }

واتە : وە ئەوانە دەڵێن بڕوامان هێناوە بە خـوداو بە پێغەمبەر و گوێڕایەڵیمان كردووە پاشان كۆمەڵێك لەوان پشتی تێ دەكەن لە پاش ئەوەی ( ووتیان بڕوامان هێناوە ) وە ئەوانە ( لەڕاستیدا ) ئیماندار نین ★ وە كاتێ بانگ بكرێن بۆ لای ( شەریعەتی ) خـودا و پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ئەوەی حوكم بكات لە نێوانیاندا یەكسەر كۆمەڵێك لەوانە ڕوو وەردەگێڕن ★ بەڵام ئەگەر ( لە حوكم دانەكە ) حەقەكە بۆ ئەوان بێت دێن بۆ لای ( حوكمەكە ) بەوپەڕی ملكەچییەوە ★ ئایا دڵەكانیان نەخۆشی تێدایە یا لە گوماندا بوون یان دەترسن خـودا و پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) ستەمیان لێ بكەن ( نەخێر هیچ لەوانە نییە ) بەڵكو ئەوانە هەر خۆیان ستەمكارن [ سورەتی النور : 47 , 50 ــ تەفسیری پوختە ].

جا لێرەدا الله تعالى باسی حاڵی مونافیقەكانی كرد ، كە ئەوان لە ڕووكەشدا ئیمانەكەیان ئیعلان دەكەن و ڕادەگەیەنن ، بەڵام ئەم مونافیقانە لەدوای ئەم ڕاگەیاندنی ئیمانە ڕوو وەردەگێڕن لە گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە ئەوانە كاتێک كەوا بانگ دەكرێن بۆ لای بەرنامەی الله و پێغەمبەرەكەی بۆ ئەوەی حوكم بكات لە نێوانیاندا ، خێرا دەستەیەكیان پشت هەڵدەكەن و ناڕەزایی دەردەبڕن، بەڵام ئەگەر بزانن ئەو سوود و قازانج و حەقەكە بۆ ئەوان بوو و بەوان دەدرا ، بەپەلە دێنە لای و ملكەچی ئەبن و ڕازی دەبن بە بڕیاری پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ،

پاشان الله تعالى نكۆڵی ئەم كارەیان لێ دەكات { أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ } أي : نفاق ؟

واتە : ( ئایا دڵەکانیان نەخۆشی تێدایە ) واتە : ئایا نەخۆشی نیفاق و دوو ڕوویی تێدایە ؟ { أَمِ ارْتَابُوا } وشکّوا ؟ واتە : ( یان ئایا دوو دڵن ) و گومانیان هەیە ؟ { أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ } أي : يظلمهم ؟ واتە : ( یان لەوە دەترسن ( کە لەکاتی بڕیارەکاندا ) الله تعالى و پەیامبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) ستەم و ناهەقییەکیان لێ بکەن ) واتە : زوڵم و ستەمیان لێ بکەن ؟

بل في الحقيقة { أُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ } بەڵکو لە حەقیقەتدا ( ئەوانە لە بنەڕەتدا خۆیان ستەمکارن ) .

العلامة إبن كثير ( رەحمەتی الله لێی بێت ) کە بەدواداچوونێک لەسەر ئەم ئایەتانە دەکات و دەفەرموێت :

- الله تعالى باسی صیفات و خەسڵەتی دوو ڕووەکان دەکات ، ئەو کەسانەن کە ئەوەی دەریدەخەن پێچەوانەی ئەوەیە کە لە ناو دڵیاندایە و ئاشرای ناکەن ،

- کەوا بە زمانیان قسەیەک دەکەن ( بەڵام بە دڵ شتێکی ترە )

{ وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ }

أَيْ : يُخَالِفُونَ أَقْوَالَهُمْ بِأَعْمَالِهِمْ ، فَيَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ.

واتە : ( وە ئەوانە دەڵێن بڕوامان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەر و گوێڕایەڵیمان کردووە پاشان کۆمەڵێك لەوان پشتی تێ دەکەن لە پاش ئەوەی ( ووتیان بڕوامان هێناوە ))

واتە : قسەکانیان پێچەوانەی کردەوەکانیانە ، جا ئەو شتەی کە دەیڵێن جێبەجێی ناکەن ،

- بۆیە لەبەر ئەمە الله تعالی دەفەرمویێت : { وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ } واتە : ( وە ئەوانە ( لەڕاستیدا ) ئیماندار نین ) .

- وە هەروەها الله تعالی فەرموویەتی : { وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ } واتە : ( وە کاتێ بانگ بکرێن بۆ لای ( شەریعەتی ) خـودا و پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەوەی حوکم بکات لە نێوانیاندا یەکسەر کۆمەڵێك لەوانە ڕوو وەردەگێڕن ).

واتە : کاتێک کەوا داوایان لێ بکرایە بۆ ئەوەی شوێنی ئەو ڕێگەی ڕاست و ڕەوانە بکەون ، کە الله تعالی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی دایبەزاندووە ، ئەوا ڕوویان وەردەگێڕا و خۆیان بە گەورە دەزانی پێیان شوورەیی بوو کە شوێنی بکەون .

- وە ئەم ئایەتەش وەک ئەم ئایەتەیە کە الله دەفەرمویێت :

{أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا * وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا}

واتە : ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ ( کە قورئانە ) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە ( کە تەوراتە ) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خـودا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی ★ وە ئەگەر پێیان بوترێ : وەرن بۆ لای ئەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ، وە بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم )) دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگەڕانێکی تەواو.

[ سورەتی النساء : 60 , 61 ــ تەفسیری پوختە ]

- وَفِي الطَّبَرَانِيِّ مِنْ حَدِيثِ رَوْحِ بْنِ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنِ الْحَسَنِ ، عَنْ سَمُرَةَ مَرْفُوعًا : " مَنْ دُعِي إِلَى سُلْطَانٍ فَلَمْ يُجِبْ ، فَهُوَ ظَالِمٌ لاَ حَقَّ لَهُ "

واتە : هەرکەسێک بانگکرا بۆلای فەرمانڕەوایەک ( کە شەرعی الله تعالی جێبەجێ دەکات ) بەڵام ناڕازی بوو و نەچوو بەدەم بانگەوازەکە ، ئەوا زاڵمە و حەقی بۆ نییە .

- وە الله تعالی دەفەرموێت : { وَإِنْ يَكُنْ لَهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ } واتە : ( بەڵام ئەگەر ( لە حوکم دانەکە ) حەقەکە بۆ ئەوان بێت دێن بۆ لای ( حوکمەکە ) بەوپەڕی ملکەچییەوە ).

واتە : ئەگەر ئەو حوکم و بڕیارە لە قازانجی ئەوان بوو دژیان نەبوو ، دێن و باش گوێ دەگرن و گوێڕایەڵ دەبن ، ئا ئەوە مانای { مُذْعِنِينَ }ـە .

∮ وانـەی بـیســـت و دوو ( 22 )∮

- بەڵام ئەگەر ئەم حوکم و بڕیار دانە لە بەرژەوەندیان نەبوو ئەوا ڕوو وەردەگێڕن و بانگەوازی بۆ ناحەق دەکەن و ڕێی ناهەقی دەگرنە بەر ، وە هەروەها پێیان خۆشە کە حوکم و دادوەری ببەنەوە بۆ غەیری پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ئەوەی برەو بە باطل ـەکەی خۆیان بدەن.

- جا ئەو کاتەی کە ملکەچ دەبن و ڕازی دەبن لەبەر ئەوە نییە کە بڕوایان پێی هەیە و هەر ئەوەیان پێ ڕاستە.

- بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە موافق ـی هەواو ئارەزووی خۆیانە و پێیان خۆشە ، چونکە هەرکاتێک حەق لەگەڵ خواست و ئارەزووی ئەواندا نەبوو ئەوا لێی لادەدەن و بڕوای پێ ناهێنن.

- بۆیە لەبەر ئەمە الله تعالى دەفەرموێت : { أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَمِ ارْتَابُوا أَمْ يَخَافُونَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ } واتە : ( ئایا دڵەکانیان نەخۆشی تێدایە یا لە گوماندا بوون یان دەترسن خـودا و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) ستەمیان لێ بکەن )

- واتە : ئەو کارەیان لەمانە بەدەر نییە : یان دڵیان نەخۆشی تێدایە و پێیەوە دەناڵێنن.

- یان گومانیان بۆ پەیدا بووە لەم ئاینیە ، یان ترسیان هەیە کە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ناهەقیان پێ بکەن لەو دادوەریەی کە دەیان کەن.

- هەر کامێک لەوانە بێت ، ئەوە بێ ئایینی و خـودا نەناسیەکی تەواوە ، الله تعالی ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیەو هیچی لێ وون نابێت.

پاشان إبن کثیر ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت : پاشان الله تعالی باسی ڕەوشتی ئەو ئیماندارانە دەکات کە چوون بە دەم بانگەوازی الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم )، ئەوانەی کە هیچ ئاینێکی تریان ناوێت جگە لە کتێبی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ).

جا فەرموویەتی : {إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا} " أَيْ : سَمْعًا وَطَاعَةً " .

واتە : بەڵام گوفتاری ئیمانداران کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای خـودا و پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن : بیستمان و گوێڕایەڵین.

*جا ئەوانن ئیماندارانی حەق و ڕاستەقینە*

وە هەروەها الشیخ إبن تیمیة ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت : (کە ئەویش ڕوونکردنەوەیەک لەسەر هەمان ئەم ئایەتانە دەدات کە لەبارەی موناڤیقانەوەیە) :

" نەفی کردن و نکۆڵی کردنی ئیمان کردووە ( واتە : الله تعالی نەفی ئیمانی کردووە ) لەسەر کەسێک کە ڕوو وەردەگێڕێت لە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وە هەواڵی داوە کە ئیمانداران هەرکاتێک کەوا بانگ دەکرێن بۆلای الله تعالی و پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی حوکم و دادوەری بکات لە نێوانیان ئەوا دەبیستن و گوێڕایەڵ دەبن، جا ڕوونی کردەوە کە ئا ئەمە لە پێویستیەکانی ئیمان هێنانە ( لوازم الإیمان ) .

جا کەواتە پوختەیەک لەوەی کە پێشووتر باسکرا بریتین لەمانە :

① لە صیفات و خەسڵەتی مونافیقان ئەوەیە کە ئەو شتانەی دەیڵێن پاشان جێبەجێی ناکەن ، وە کردەوەکانیان پێچەوانەی قسەکانیانە .

② هەرکەسێک ڕوو وەرگێڕێت لە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، جا هیچ گوێڕایەڵیەکی بۆی نەبێت وە بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر نەبێت ( صلی الله علیه وسلم ) ، ئەوا صیفەتێک لە صیفەتەکانی مونافیقی بنەڕەتی تێدایە .

③ مونافیقەکان پشت دەکەن و ڕوو وەردەگێڕن لە حوکمی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) وە نایانەوێت کە حوکم بگێڕنەوە بۆلای پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) تەنها ئەگەر بێتوو حەقەکە لە بەرژەوەندی ئەوان بوو وە بڕیاردانەکە هەر بۆ ئەوان بێت.

بەڵام ئەگەر حەق و بڕیار دانەکە لە بەرژەوەندیان نەبوو ، ئەوا نایانەوێت حوکمەکە ببەنەوە بۆلای الله تعالی و پێغەمبەرەکەی تاوەکو حوکم و بڕیار نەدرێت بەسەریاندا .

④ هەرکەسێک حوکم و دادوەری نەگەڕێنێتەوە بۆلای الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ئەوا تووشی نەخۆشی نیفاقی گەورەی دەرکەر لە میلەتی ئیسلام بووە.

وە بەلایا تێپەڕ بووین لەم ووتەیەی الله تعالی کە ناڕەزایی و ئینکاری ئەم کارەیان لێ ئەکات ، کە دەفەرموێت : {أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ارْتَابُوا أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ بَلْ أُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ}

واتە : ئایا دڵەکانیان نەخۆشی تێدایە یا لە گوماندا بوون یان دەترسن خـودا و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ستەمیان لێ بکەن ( نەخێر هیچ لەوانە نییە ) بەڵکو ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن .

- وە ئەو ووتەیەی إبن کثیر ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) لە لێدوانی لەسەر ئەم ئایەتەدا فەرمووی : " وأيًا ما كان فهو كفر محض " واتە : هەرکامێک لەوانە بێت ئەوا کوفر و خـودا نەناسیەکی تەواوە .

⑤ ئیماندارران لەکاتی کێشەو ناکۆکیدا حوکم و دادوەری دەبەنەوە بۆلای قورئان و سوننەت ، جگە لەم دووانە حوکم و دادوەری بۆ هیچ شتێکی تر نابەنەوە ، لەبەرئەوەی ئیمانداران حوکم هەر دەگەڕێننەوە بۆلای الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) .

6 ئیمانداران کاتێک کە بانگ دەکرێن بۆلای الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) تەنها یەک قسەیان هەیە ، کە ئەویش بریتیە لە ( سمعنا وأطعنا ) جا نکۆڵی ناکەن و خۆ بە گەورە نازانن وە ڕوو وەرناگێڕن یان پشتی تێ بکەن ،

" بەڵکو دەڵێن : ( سمعٌ وطاعة ) "

( اللهم اجعلنا من المتقين العاملين بنهجك وسنة نبيك .. )

## ∮ وانـەی بـیســـت و سـێ ( 23 ) ∮

بە کورتی باس لەو بابەتە دەکەین کە لە پێشووتر باسکرا :

کە ئەویش بریتییە لە ( لە تایبەتمەندیەکانی پەروەردگارمان سبحانە وتعالی یاسا دانان و حوکم و بڕیاردان و حەڕام کردن و حەڵاڵ کردن ـە ) .

وە بەڕاستی ئا ئەمەش ( ڕوکنی دووەمە لە بە تاک دانانی پەروەردگارمان سبحانە وتعالی لە پەرستنیدا ) ...

① حوکم و بڕیاردان یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی الله سبحانە وتعالی ، هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ } واتە : گشت حوکم و بڕیارێك تەنهاو تەنها هی خـودایە ، دەبێ تەنها ئەو حاکم و بڕیار بەدەست بێت.

[ سورەتی یوسف : 40 ــ تەفسیری ڕامان ]

وە هەروەکو چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیە وسلم ) دەفەرموێت : « إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ » واتە : بەڕاستی الله خۆی دادوەرە ، وە حوکمیش هەر بۆ ئەوە.

② هەرکەسێک ناکۆکی لەگەڵ الله تعالی کرد لە یاسا دانان و حوکم و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ئەوا ئەو کەسە طاغوت ـە

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا }.

واتە : ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ ( کە قورئانە ) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە ( کە تەوراتە ) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خـودا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی .

[ سورەتی النساء : 60 ـ تەفسیری پوختە ]

▪ جا هەر کەسێک خەڵکی حوکم و دادوەری بۆلای بباتەوە لە غەیری الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ئەوا ئەو کەسە ( طاغوتە )

- واتە : سنوری بەزاندووەتە سەر حەق و مافێکی الله تعالی : { يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ } واتە : دەیانەوێت کە حوکم و دادوەری ببەنەوە بۆلای طاغوت.

- وە الله سبحانە وتعالی فەرمانی بە خەڵکی کردووە کە کوفر بکەن پێی : { وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ } واتە : لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت.

- وە حوکم گێڕانەوە بۆلای سەر لێ شێوایی و گومڕاییەکی دوور لە ڕاستیە و شوێنکەوتنی شەیتانە : { وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلالاً بَعِيدًا } واتە : وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی .

③ هەرکەسێک حوکم و دادوەری بە غەیری ئەو قورئانە بکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسە کافرە ، جا یەکسانە فەرمانڕەوا بێت یان دادوەر بێت ...

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرمویت : { وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزل اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ } واتە : وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێ باوەڕن و موسوڵمان نین.

[سورەتی المائدة : 44 ــ تەفسیری پوختە]

④ حوکم کردن بە غەیری حوکم و بڕیاری الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) لە ( تایبەتمەندیەکانی جاهیلیەتە ) .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرمویت : { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ } واتە : ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن ؟ ئایا کێ حوکم و بڕیاری لە هی خـودا جوان و چاکترە ؟ لای کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە .

[ سورەتی المائدة : 50 ــ تەفسیری پوختە ]

جا لێرەدا " حوكمی الله تعالی " هەیە ، وە " حوكمی جاهیلیەت ـیش " هەیە ، كە ئەویش هەموو ئەو حوكم و بەرنامانە دەگرێتەوە كە پێچەوانەی شەرعی الله سبحانە وتعالی دەكات .

⑤ حەڕام كردنی حەڵاڵ وە حەڵاڵ كردنی حەرام كوفرە ، وە ئا ئەوەش لە هۆكارەكانی كوفری ئەهلی جاهیلیەت بوو، وە حەڵاڵ كردنی حەڕامێک یان نكۆڵی كردنی ئەحكامە جێگیرەكان كوفرە بە نەص ـی قورئان و سوننەت و ئیجماع.

هەروەكو چۆن الله تعالی دەفەرموێت لەبارەی كافرەكان وە هەروەكو چۆن جەنگیشیان حەڵاڵ دەكرد لە مانگەكانی حەڕام : {إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلِّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا لِّيُوَاطِؤُواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ اللّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ}

واتە : بەڕاستی دواخستن و گۆڕینی ( مانگە حەرامەكان ) ڕۆچوونە لە بێ باوەڕیدا بێ باوەڕانی پێ گومڕا دەكرێت ( دواخستنەكە ) ساڵێك حەڵاڵی دەكەن و ساڵێك حەرامی دەكەن بۆ ئەوەی ڕێك ببن لەگەڵ ژمارەی ئەو چوار مانگەی كە خـودا ڕێزداری كردوون ( جەنگی تێدا حەرام كردووە ) سەر ئەنجام ئەوەی خـودا حەرامی كردبوو حەڵاڵی دەكەن ، جوانكراوە بۆیان كردەوە ناشرینەكانیان خـوداش ڕێنموونی كەسانی بێ باوەڕ ناكات [ سورەتی التوبة : 37 ــ تەفسیری پوختە ]

مانای ئەم ئەیەتە : الله تعالی باسی ( النسيء ) دەکات واتە : دواخستن و دەستکاری کردن ( کە ئەویش دەست تێوەردانە لە مانگەکانی حەڕام ، کاتێک ئەهلی جاهیلیەت هەندێک جار پێویستیان بە جەنگ کردن دەبوو لە هەندێک لە کاتەکانی مانگی حەڕام.

جا هەتاوەکو ڕێکیان دەخست لەنێوان حەڕام کردنی جەنگ لە مانگەکانی حەڕام وە لەنێوان هێنانەدی مەبەستەکەیان ، بە ڕاو بۆچوونە خراپەکەیان وایان دەبینی کە چوار مانگەکە حەڕامن لە سوننەتدا ، جیاوازی نییە لە مانگەکانی حەڕام بێت یان مانگەکانی تر.

جا بۆ نموونە مانگی " صفر "ـیان دەهێنایە ڕیزی مانگی موحەڕەم ، پاشانیش جەنگیان تێیدا حەڕام دەکرد لە شوێنی ئەو مانگانەی الله حەڕامی کردووە.

جا کەواتە مانگێکی تریان دەگۆڕیەوە بە غەیری مانگە حەڕام کراوەکان ئەوە بریتییە لە ( النسيء ) واتە : دەستکاری کردن ، وە ئەصلەکەی لە دواخستنەوەیە ، جا ئائەمە بوو بیدعە باطل ـەکەیان ، وە هەروەها الله عز وجل ناوی بردن بە ( زيادة في الكفر ) واتە : ڕۆچوون لە بێ باوەڕیدا.

واتە : ئەوان لە سەرەتادا کافر بوون وە ئەم دەستکاری کردنەشیان بیدعەیەک بوو کردبوویان ڕۆچوونێکی زیاتر بوو لەنێو کوفردا ، کاتێک کەوا حەڵاڵیان دەکرد جەنگ کردن لە مانگەکانی حەڕام ، جا کافر بوون بەهۆی ئەمەوە کە حەڵاڵ کردنی حەڕامێک

بوو ، وە جارێکی تریش کافر بوونەوە لەبەر ئەوەی بیدعەیەکیان لە دینی الله داهێنا کە لە دیندا نەبوو ، وە هێنایانە ئاست پلەو پایەی شەرعی الله و دینەکەی .

جا الله عز وجل باسی ئەو دەستکاری کردنەی کرد کەوا ڕۆچوونێک بوو لە کوفرەکەیان هەروەک لە ئایەتەکانی پێشووتر باسکرا ، جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەمانەی خوارەوە :

أ ) حەڵاڵ کردنی حەڕامێک کە بڕاوەتەوە بە حەڕامیەکەی ئەوا کوفرە ، وە هەر لەسەر ئەمەش ئیجماعی زانایانی موسلمانی لەسەرە ، هەروەکو چۆن الطحاوي ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت : " ولا نكفر مسلمًا من أهل القبلة بذنب ما لم يستحله "

واتە : وە هیچ موسلمانێک بە کافر نازانین لە ئەهلی قیبلە بەهۆی ئەنجامدانی تاوانێک تاوەکو بە حەڵاڵی دەزانێت .

وە هەروەکو چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) لە فەرموودەیەکی " القدسي " ـدا دەفەرموێت الله تعالى دەفەرموێت : « إِنيِّ خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ »

واتە : من تەواوی بەندەکانم لەسەر ئایینی خـودا ناسی و لەسەر یەک خـودا پەرستی بەدیهێناوە ، پاشان شەیتانەکان لە ڕێی ئەو ئایینە ڕاستە ئەوانیان ترازاند ، وە ئەو شتانەشیان لـێ حەرامکردن کە من بۆم حەڵاڵ کردبوون.

ب ) یاسا دانانێک کە الله تعالی مۆڵەتی پێی نەداوە و پابەند کردنی خەڵکی بەم یاسایەش کوفری أکبر و گەورەیە ، لەبەرئەوەی ناکۆکی کردنە لەگەڵ الله عز وجل لە تایبەتمەندیەکانی.

⊖ هەروەکو چۆن ئەوەی دەکرێت و ڕوو دەدات لە لێژنەی یاسادانان لە ئەنجومەنی گەل ( پەرلەمان )، کاتێک کەوا قانون و یاسایەک دەردەکەن و خەڵکی پێیەوە پابەند دەکەن وە پێچەوانەی شەریعەتە ، جا ئائەمانە ناکۆکی لەگەڵ الله عز وجل دەکەن لە پەرستنیدا ، وە هەروەها یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن بۆ خۆیان دەگەڕێننەوە نەوەک بیگەڕێننەوە بۆ شەرعی الله عز وجل .

⑥ مرۆڤی موسلمان حوکم و دادوەری بۆ هیچ یاسایەک ناگەڕێنێتەوە تەنها بۆ کتێبی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی نەبێت ( صلی الله علیه وسلم )

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ }

واتە : جا ئەگەر دوو بەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خـودا و پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خـودا و بە ڕۆژی دوایی [ سورەتی النساء : 59 ــ تەفسیری پوختە ]

– جا هەرکەسێک کێشەو ناکۆکی نەگەڕاندەوە بۆ حوکم و بڕیاری الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوا ئەو کەسە ئیمانی بە الله و بە ڕۆژی دوایی نەهێناوە ،

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ } واتە : وە هەرشتێك كە تێیدا جیاواز بوون ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خـودا دەگەڕێتەوە.

[ سورەتی الشورى : 10 ــ تەفسیری پوختە ] .

⑦ گوێڕایەڵی کردن لەم حەڕامەی کە حەڵاڵ دەکرێت یان ئەو حەڵاڵەی کە حەڕام دەکرێت کوفرە ، هەروەکو چۆن الله تعالى لەبارەی یەهود و گاورەکانەوە دەفەرموێت :

{ اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا } واتە : ( گاورو جوو ) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خـودا ( ملکەچ و فەرمانبەرداریانن ، ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن ) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش ( بەکوڕی خـودا دەزانن ) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خـودایەک.

[ سورەتی التوبة : 31 ــ تەفسیری ئاسان ]

جا هەروەک ئەوەی کە بینیمان لە فەرموودەکەی " عەدی کوڕی حاتەم " لە کاتێکدا کە کەسێکی گاور بوو وە چوو بۆلای پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) گوێی لێ بوو کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ،

- جا بە پێغەمبەری گووت ( صلى الله عليه وسلم )

( إِنَّا لَسْنَا نَعْبُدُهُمْ ) واتە : ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست.

لەبەرئەوەی وا گومانی برد کە عیبادەت و خـودا پەرستی تەنها کورت کراوەتەوە بەسەر نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و هاوشێوەی ئەمانە ، جا پێغەمبەری خـوداش ( صلى الله عليه وسلم ) پێی فەرموو : « أَلَيْسَ يُحَرِّمُونَ مَا أَحَلَّ اللهُ فَتُحَرِّمُونَهُ ، ويُحِلُّونَ مَا حَرَّمَ اللهُ فَتَسْتَحِلُّونَهُ ؟ » قال عدي : بلى ، فقال النبي ( صلى الله عليه وسلم ) : « فَتِلْكَ عِبَادَتُهُمْ »

واتە : ئایا ئەو شتەی کە الله حەڵاڵی کردبوو ئەوان حەڕامیان نەدەکرد جا ئێوەش بە حەڕامتان ئەزانی ، وە ئەو شتەی الله حەڕامی کردبوو ئەوان حەڵاڵیان نەدەکرد ئێوەش بە حەڵاڵتان ئەزانی ؟ عەدی ـش گوتی : بەڵێ ، جا پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : " ئا ئەوە بەندایەتی کردن و گوێڕایەڵی کردن و پەرستنیانە " .

جا لێرەدا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ڕوونی کردەوە کە مانای عیبادەت و پەرستنی ( الأحبار والرهبان ) واتە : زاناکان و عابیدەکان ،

واتە : گوێڕایەڵی کردنیان لە حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن بە پێچەوانەی ئەوەی الله سبحانە وتعالی کردوویەتیە شەرع و خۆی دایڕشتوویەتی .

- جا بۆیە واجبە کەوا ئێمە بزانین کە زانایان تەنها ئەم شەریعەتی ئیسلامە ئەگوازنەوە، وە هەروەها ئەوان لە هەموو خەڵکی تێگەیشتووترن لە شەریعەت، جا هەرگیز داوا نەکراوە بە شوێنکەوتنی خودی خۆیان ، ئەگەر لەلامان چەسپا لە پێچەوانە کردنێکیان بۆ دەقێکی شەرعی ، جا بۆمان درووست نییە شوێنکەوتنی ڕاو بۆچوونەکانیان ، بەڵکو واجبە لەسەرمان کەوا شوێنی دەقی شەرعی بکەوین.

## ∮ وانــەی بـیســـــت و چـوار ( 24 )∮

کورتەیەک لەوەی پێشووتر باسکرا :

(1) واتای " لا إله إلا الله " :

بە تاک دانانی الله سبحانه وتعالى لە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ، وە بێگومان شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله بە تەنها کورت نەکراوەتەوە بەسەر ئەنجامدانی عیبادەت و بەندایەتی بۆ غەیری الله تعالى ،

بەڵکو هەروەها ئەمانەش دەبێتە شیرک بڕیاردان بۆ الله بە حەرام کردنی حەڵاڵـێک ، یان حەڵاڵ کردنی حەڕامـێک ، یان یاسا دانان و تەشریع ، کە الله تعالى مۆڵەتی پێی نەداوە ...

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ } واتە : ( ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بە بەرنامەی خـودا ) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەڕانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی خـودا مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت ( حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن ) ،

[ سورەتی الشورى : 21 ــ تەفسیری ئاسان ] .

② بەڕاستی هەر کەسێک یاسا و بەرنامەیەک دابهێنێت و دایڕێژێت لە شوێنی الله تعالى ئەوا ئەو کەسە طاغوتە ، هەروەها ناکۆکی لەگەڵ الله عز وجل دەکات لە پەرستنیدا .

وە بەڕاستی واجبە لەسەر مرۆڤی موسلمان کە هەموو حوکم و دادوەریەک بگەڕێنێتەوە بۆ قورئان و سوننەت .

وە مرۆڤی موسلمان حوکم و دادوەری ناگەڕێنێتەوە بۆ غەیری قورئان و سوننەت ، مەگەر موناقیقەکان نەبێت کە نیفاقی گەورەی هەیە و دەرکەرە لە ئاینی ئیسلام .

## ∮ وانــەی بــیســـــت و پێــنج ( 25 ) ∮

هاوتای ئەوەی کە لە پێشووتر باسکرا واجبە لەسەر مرۆڤی موسلمان کە بزانێت کەوا ئەو لە سەردەمی غوربەت و نامۆیەتی ئیسلام ـدا دەژیت ، چونکە بەڕاستی سەرجەم ئەو یاسایانەی کە لە عالەمی ئیسلامی جێبەجێ دەکرێت و زاڵ بووە بەسەریدا یاسا و قانونی کافرانە ، کە وەرگیراوە لە یاسای فەڕەنسی یان ئینگلیزی یان سویسڕی یان عورف و عادەت یان هەواو ئارەزوو و مەصالیح و بەرژەوەندی ، بۆیە واجبە لەسەر مرۆڤی موسلمان کە هەندێک لەم شتانە بزانێت کە پێچەوانەی ئیسلامە.

وە بەڵکو ئەو قانون و یاسایانەش خۆی دەسەپێنێت بەسەر تەواوی ئوممەتی ئیسلامی هەتاوەکو هەموو خەڵکی وا لێدەکات کە بسوڕێنەوە بە دەوری طاغوتەکان و بەرنامەکەیان ،

وە ئەویش :

⊖ ① عەلمانیەت : بریتییە لە فیکرە و بیرۆکەی ڕۆژئاوایی لە بنچینەدا ، وە مانای حەرفیەکەی واتە : ( اللادينية ) واتە : بێ دینی.

وە لە ڕووی مانای پێناسەوە ( فصل الدين عن الدولة ) واتە : ( جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ) .

جا ئەم دەوڵەتە دەبێتە دەوڵەتێکی نەبەستراو بە ئەحکامەکانی دین لە سیاسەتی یان لە یاسا دانانی یان لە ڕێکخستن و دامەزراوەییەکەی یان لە حوکمەکانی.

لە غەیری ئەمانەش لە تایبەتمەندیەکانی دەوڵەت یان لە هەموو کارو بارە جیاوازەکانی دەوڵەت.

وە دەبێت دین ـیش تەنها بچێتە ناو گۆشەی مزگەوتەکانەوە یان تەنها ئەو شوێنانەی تایبەتە بە عیبادەت ، هیچ دەستەڵاتێکی بەسەر دەوڵەت ـدا نییە ، یان لەو کارو بارانەی کە لەناو دەوڵەت ڕوو دەدات.

وە ئا ئەم فیکرەیەش لە بنچینەدا لە گاورەکانەوە وەرگیراوە کە دەڵێت : (دع ما لقیصر لقیصر ، وما لله لله) واتە : واز بهێنە لەو شتانەی کە بۆ پادشایە بۆ پادشایە ، وە ئەوەشی بۆ خودایە بۆ خودایە ( وە زیاتر مەبەست لە " قیصر " نازناوێکە دراوەتە پاڵ پادشاکانی ڕۆم و ڕووس )

پاشان ئەم فیکرەیە بناغەی داکوتا لەدوای سەرهەڵدانی شۆڕشی فەڕەنسی کە دەیانویست سنورێک دابنێن بۆ ئەو دەستەڵاتەی کە کەنیسە دەستی بەسەردا دەڕواو دەستەڵاتی بەسەردا هەیە ، وە هەروەها هاوپەیمانیەکی بەست لەگەڵ پادشایە فەرمانڕەوایە ستەمکارەکان ، ئینجا شۆڕشی فەڕەنسی بڕیاری دەرکرد بە سنووردار کردنی کەنیسە و دەستەڵاتەکەی بۆ ناو چوار دەوری دیواری کەنیسە.

وە ئیعلانی مەبدەئـو باوەڕی ڕێبازی بێ دینی کرد ( اللاديني ) ، واتە : ئەو باوەڕەی کە پابەند بە حوکمەکانی دین و فەرمانەکانی نابێت ، وە دەبێت دەستەڵاتی کەنیسە تەنها دەستەڵاتێکی ڕوحی و دەروونی بێت ، وە نابێت هیچ پەیوەندیەکی هەبێت بە کارو باری دەوڵەت نە لە نزیکەوە وە نە لە دوورەوە .

وە دەبێت ئەم دەستەڵاتی دینیە تەنها لە ناو چوار دەوری دیواری کەنیسە بێت ، وە ئەم مەبدەئـو بنەما و باوەڕە دەکرێت کەوا بگونجێت لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئەورووپای کافر ، لەبەرئەوەی ئاینی مەسیحیەت پێکنەهاتووە لەسەر تەشریعات و یاسا دانان وەکو هاوشێوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام .

جا ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەو حەددانە دەگرێتەوە کە دایناوە وە زۆر یاسای داڕشتووە ، وەک : میراث و ئەحکامەکانی و حەڕام کردنی ریبا وە زۆر شتی تری وەک ئەمانە.

وە فرۆشتنە حەڕام کراوەکان دیاری دەکات وە ئەو مامەڵانەی کە حەڵاڵە وە ئەوەشی کە حەڕامە دیاری دەکات ، وە زەواج و هاوسەرگیری کردن و ئەوانەشی کە بەستراونەتەوە بە زەواج دیاری دەکات ، وە تەبەنی و ظهار ـیش حەڕام دەکات ( التبني / واتە : لە خۆگرتنی منداڵ ، واتە : کەسێک کوڕێک یان کچێک بکاتە مناڵی خۆی ) ( الظهار / واتە : شوبهاندنی خێزانی بە دایکی خۆی ) ، وە هەروەها چەندین مەرجی داناوە بۆ فەرمانڕەوا و دادوەر .

وە ڕێکخستنەکانی بۆ کەسی فەرمانڕەوا و ئەو کارانەی کە پێی سپێردراوە لەگەڵ گەلەکەی لە ڕوویەکدا وە لەگەڵ وڵاتانی تریش لە ڕوویەکدا .

وە پەیوەندیەکی دیاری کراویشی داناوە لەگەڵ نا موسلمانان " وەک : یەهود و گاور " لەناو دەوڵەتی ئیسلامی ـدا.

وە چەندین فەرمان و ئەحکام ـیشی داناوە بۆ جەنگ و ئاشتی و جەنگ و شەڕ ڕاگرتن و جگە لەمانەش.

وە هەروەها مەی و بەراز و مردارەوەبوو و خوێنی ڕژاو و خواردنی گۆشتی ئاژەڵە دڕندەکان و باڵندە دڕندە و مەترسیدارەکان ـیش حەڕام دەکات .

ئا بەم شێوەیە دەبینین کە ئاینی ئیسلام شەریعەتێکی ڕێک و پێک و تەواوە بۆ هەموو کارو بارەکانی ژیان ، وە بۆ چاککردنی کۆمەڵگا و فەرمانڕەوا و وڵاتان و کۆمەڵگاکان ،

هەموو ئەم حوکمانەش مەوجودە و هەیە لەناو کتێبی الله تعالى و سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) پاشان ئیجماعی زانایانی ئیسلامی.

جا بۆیە بەڕاستی الله سبحانه وتعالى پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) دەدوێنێت بە صیفەتی یەکەم حاکم بۆ موسلمانان ، جا الله عز وجل پێی دەفەرموێت : { وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ }

واتە : وە ( فەرمانمان پێ کردی ) کە حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی کە خـودا ناردوویەتیە خوارەوە و شوێن حەزو ئارەزوویان نەکەوی وە وریا بە لێیان لەوەی بت ترازێنن لە هەندێ لەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت.

[ سورەتی المائدة : 49 ــ تەفسیری پوختە ] .

کەواتە ئەو کارەی کە خراوەتە ئەستۆی فەرمانڕەوای موسلمان ئەوەیە کە حوکم بکات بەو قورئانەی کە الله دایبەزاندە { وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أنزل اللَّهُ } واتە : وە ( فەرمانمان پێ کردی ) کە حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی کە خـودا ناردوویەتیە خوارەوە.

بەڵکو ووریای دەکاتەوە لە هەواو ئارەزووی خەڵکی کە پێچەوانەی شەریعەتە ، لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵکی ئەوەی کە پێشەوایەتیان دەکات شەهەوات و ئارەزوویانە وە بەرژەوەندی خۆیانە بۆ پێچەوانەکردنی شەرعی الله تعالی.

وە لێرەدا درووست نییە ووتەی هەبوونی مەبدەئـو بنەمای ( عەلمانیەت ) یان ( بێ دینی ) لە ئیسلام ـدا یان لەناو کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا ، لەبەرئەوەی ئیسلام یاسادانان و ئەحکام و حدودی خۆی هەیە بۆیە هەر ئەو واجبە جێبەجێ کردنی.

وە ئەو کارەی کە لە ئەستۆی فەرمانڕەوا دایە لە ئیسلام ـدا بریتییە لە ( جێبەجێ کردنی شەرعی الله سبحانە وتعالی ).

وە ئەم کارەش کاری پێ کراوە لە سەردەمی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پاشان بە درێژایی سەردەم و ڕۆژگار و چەندین سەدە کاری پێ کراوە ، وە ئەگەر لە هەندێک کاتدا تەقصیری و فەرامۆشی ڕوویداوە ، بەڵام هەموو کات گەڕانەوە هەر بۆ شەرعی الله تعالی بووە ، وە بیرو ڕای دین حوکم بەسەر هەموو شتێک دەکات هەتاوەکو فەرمانڕەوا بەسەر خۆیشیدا .

## ∮ وانـەی بـیســـت و شـەش ( 26 ) ∮

کاتێک کەوا خیلافەتی عوثمانی لاواز بوو ئەو خیلافەتەی کە شکۆو دەستەڵاتی هەبوو بەسەر زۆربەی وڵاتانی عەڕەبی ، وە هەروەها تەواوی وڵاتانی ئیسلامیـش لاواز بوو ، وە ئینجا ئەوروپا بە سوپاکەی و چەکە پێشکەوتوو و سەردەمیەکەی توانی کەوا تەواوی عالەمی ئیسلامی داگیر بکات بۆ دەیان ساڵ.

• وە هەندێک وڵاتیش هەبوو کە وڵاتانی ئەوروپا نزیکەی دوو سەدە بوو داگیری کردبوو ، جا لە ئەنجامی ئەوە بوو کە وڵاتانی ئەوروپی ئەو وڵاتانەیان داگیر کرد قەناعەتیان بە زۆرێک لە نەوەکانی وڵاتانی ئیسلامی هێنا ، بەوەی کە هۆکاری لاواز بوونیان و دواکەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ دینی ئیسلام، وە تاکە چارەسەر بۆ پێشکەوتنیان بریتییە لە جیاکردنەوەیەکی تەواو لە نێوان دین و دەوڵەت.

" هەروەکو چۆن بە تەواوی ئەوروپا ئەنجامی دا " کە دەبێت دەستەڵاتی دین تەنها لە ناوەوەی مزگەوت بێت ، وە ئەویش دەبێتە دەستەڵاتێکی ڕوحی و دەروونی ، کە هیچ پەیوەندیەکی نییە بە سیستەمی حوکم کردنەوە یان کارو باری دەوڵەت.

• واتە : بە تەواوی هەمان ئەو شێوازە جێبەجێ بکرێت کە ئەوروپا شوێنی کەوتووە لە سیستەمی حوکم کردنەوە ،

کە ئەویش مەبدەئـو بنەمای ( بێ دینی ) یان ( عەلمانیەتە ) واتە ( جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ).

• وە ئەمەش چاوەڕوان دەکرا لەبەرئەوەی داگیرکاری ئەوروپی حوکمی زۆربەی عالەمی ئیسلامی دەکرد ، وە چاوەڕوان دەکرا لەبەر سەرسام بوون بە ڕۆژئاواوە لەلایان زۆرێک لە نەوەکانی وڵاتانی ئیسلامی.

• بەڵکو سەرەڕای ئەمەش بەرپاکردنی ڕۆژنامەکان و ڕاگەیاندن و ڕادیۆکان بە شێوازێکی کارامە بۆ خەڵک لەسەر گەیاندنی ئەم فیکرە و بیرۆکە کافرەیە.

• لەگەڵ ئەوەشدا دانانی ڕێکخراوەیی تەعلیمی و فێرکاری لەسەر ئەم بابەتە ، کە لێیەوە منداڵانیان پێدەگەیاند بە شێوەیەکی نەرم و نیانی وە لەو شتانەی کە حەزو ئارەزووی منداڵی بۆی دەچێت و پێگەیاندنیان لەسەر ئەم فیکرە و بیرۆکەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەبوونی بەکرێگیراوەکانی ئەوروپا ڕاستەوخۆ هەڵستان بە جاڕدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی.

• وە هەندێکی تر هەڵستان بە دامەزراندنی حیزبە عەلمانیەکان.

• وە دارشتنی ئەم فکرەیە ئامادە بوو لە هەموو ڕێکخراوەییەکانی دەوڵەتەکان بۆ تەشجیع و هاندان لەسەر ئەم هەنگاوانە وە ئاشکراکردنی و تیشک خستنە سەری ئەم بیرۆکەیە هەتا ڕێکخستنیشی بۆ کرا لە گشت لایەکەوە لەلایەن خەڵکێکی زۆری بێ ئاگا کە دەگەڕانەوە بۆ ئەم فیکرە و بۆ ئەم مانایانە ، بەبێ ئەوەی کەوا بزانن ئەوەی ئەوان بڵاوی دەکەنەوە فیکرەی کافرانە.

• " وە پشتگیری دامەزراوەییەکان و ڕێکخراوەکانیان دەکرد و سەریانیان دەخست پێچەوانەی ئیسلام "

• ئا بەم شێوەیە هەتاوەکو لاربوونەوە بەلای ئەو عورف و عادەتە گشتیەی کە لەلای خەڵکەوە بوو ، وە لەلای فەرمانڕەوایە بەکرێگیراوەکانەوە بوو :

• کە ئەویش بریتی بوو لە مەبـدەئـو بنەمای ( جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ) یان ( عەلمانیەت ) یان ( نە سیاسەت لە دین دایە ، وە نە دینیش لە سیاسەت دایە ) ... هتد .

وە بووە پەیوەندیەکی کۆبوەوە لەسەر دەوڵەت یان نیشتیمان نەوەک لەسەر دینی الله.

وە جیهادیش بووە لە پێناوی نیشتیمان یان نیزامی فەرمانڕەوا نەوەک جیهادی لە پێناو الله.

• وە برایەتیش بووە لەبەر نیشتیمان نەوەک برایەتی لەسەر دین.

• بۆیە گوێیان لێ بووە لە مەبدەئی ( نیشتیمان پەروەری ) وە هەروەها گوێیان لە شیعاری ( دین بۆ خـودا و نیشتیمان بۆ هەمووان ) بووە.

• وە هەروەها گوێیان لە هەندێک کەسیش بووە کە بانگەوازی هەڵوەشاندنەوەی خانەی دین دەکات لەسەر " البطاقة "

• وە إکتفاء بکات بە ئاماژە بۆ کردنی لە " الجنسية " ، وە هەندێکی تر بانگەشەی حەڵاڵکردنی زەواجی نەصرانیەک لەگەڵ ئافرەتێکی موسڵمان دەکرد بە بیانووی ئەوەی کە هەموویان میسرِیین.

• وە ئەگەر ئافرەتێکی میسرِیش زەواج بکات لەگەڵ پیاوێکی سعودی یان بیانی لەبەر ئەوەی کەوا موسڵمانە کە کورِی وڵاتەکە نەصرانیە ئەوا ئەولاترە بەم کارە !!

سەرەڕای نەهێشتنی حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلامی لە هەموو بوارەکاندا.

• جا هیچ حەددێکی ئیسلامی نابێت جێبەجێ بکرێت بەسەر زیناکار یان دزی یان مەی خۆر یان رِیددە و هەڵگەڕانەوە لە دین یان غەیری ئەمانەش.

• وە هەرکەسێک وویستی کەوا مەی بفرۆشێت ئەوا بەشی خۆی دەبێت لەسەر بەدەستهێنانی موڵەت پێدانی بەم کارە.

• سەرەڕای حەڕامیەتی مەی ( مەشروب یان عارەق ) وە لە هەموو ئوتێلەکان و شوێنە گەشتیاریەکان حەقی ئەوەی هەیە کەوا مەی پێشکەش بە مەی خۆرەکان بکرێت وە هەروەها ئاسانکاری کردن بۆ داوێن پیسی .

• وە هەرکەسێکیش ویستی لە بانکەکان مامەڵە بە ریبا بکات حەق و مافی هەیە ، وە هەرکەسێک ویستی ڕاگەیاندنی بڵاوکردنەوەی زینا و فاحیشە و گاڵتە کردن بە دین بکات ئەوا حەق و مافی خۆی هەیە ... هتد .

✖ واتە : داماڵینی دین زۆر زیاتر لە ئەحکامەکانی ، وە شتەکان بەچاکی سنوردار دەبێت تەنها لە مەودایەکی تەنگ و تەسک و ناوەوەی مزگەوت.

• بەڵکو لە حەق و مافی وتار بێژ نییە لە مزگەوت کە قسەبکات لەبارەی کارو باری دەوڵەت هەتاوەکو سنوورەکانی خۆی نەبەزێنێت و نەبێتە کەسێکی توندڕەو !!

∯ وانـەی بـیســـت و حـەوت ( 27 ) ∯

ئا بەم شێوەیە مەبدەئـو بنەمای عەلمانیەت بڵاوبوویەوە لە ناو خاکی موسلمانان ، وە سیستەمی فەرمانڕەوایەتی کردن بە تەواوی بووە ئەو مەبدەئـو بنەمایە کە ئەویش بریتی بوو لە سیستەمی عەلمانیەت.

⊖ وە هەندێکیش پێیان دەگوت سیستەمی ( مەدەنی )

ئا بەم شێوەیەش کۆتایی هات بە هەڵوەشاندنەوەی زۆربەی شەرعی الله سبحانە وتعالی ، وە هەرکەسێکیش بانگەوازی کردبوایە بۆ حوکم کردن بە شەرعی الله تعالی ئەوا سەرەنجامەکەی زیندانی کردن بوو ،

وە لە چاکترینی حاڵەکانیشی ئەوە بوو کە پێی دەوترا : توندڕەو یان تیرۆریست و ئیرهابی.

لە غەیری ئەمانەش لە جۆرەها توهمە و تۆمەتی باطل دەدرایە پاڵی ئەو باطل ـەی کە حوکمەکانی لەسەر خەڵکی تێکەڵ و شێوێندرا بوو.

▪ جا لەساڵی " 1924 ز " موجریم کەمال ئەتاتورک ( کە بنچینەکەی لە جولەکەی " الدونمة الأتراك بوو " ) هەڵستا بە :

• هەڵوەشاندنەوەی ئەحکامەکانی ئیسلام.

• وە هەڵوەشاندنەوەی بانگدان بە زمانی عەرەبی.

- وە هەڵوەشاندنەوە و نەهێشتنی حیجاب.

- وە هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی ئیسلام بە گشتی.

▪ جا ئەم ئەفکارە و بیرۆکە شەیتانیە بڵاوبوویەوە لە عالەمی ئیسلامی ، وەک بڵاوبوونەوەی ئاگر لە پووش و پەڵاش ، هەتاوەکو غەریبی و نامۆیەتی بۆ ئیسلام گەڕایەوە هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەواڵی بەمە دابوو.

کاتێک کەوا دەفەرموێت : «بَدَأَ الإِسْلَامُ غَرِيبًا ، وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ»

واتە : ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد ، وە لە داهاتوویەکی نزیکیش غەریب و نامۆ دەبێتەوە هەروەکو چۆن بە غەریبی دەستی پێ کرد ، جا سەرفرازی و خۆشحاڵی بۆ نامۆکان .

وە ئەم پیاو و ئافرەتە موسلمانانەی کە لەسەر حەق و ڕاستی بوون و هەڵدەستان بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی الله تعالى ، بەڵام دەترسان لەوەی کە بانگەوازی بکەن بۆ دینی الله تعالى بەم شێوەیەی کە الله تعالى دەیەوێت ، بەڵکو دەترسان لە إظهار کردن و ئاشکرا کردنی پابەندبوونیان بە دینەوە ، لە ترسی زەبرو زەنگی فەرمانڕەواکان و دارو دەستەکانیان، جا ئەو دەرئەنجامانە بوونە هۆی فەرمانڕەوایەتی کردنی کوفر.

- وە زاناکانیش بێ دەنگ بوون.

- وە لەسەر هەندێک لە خەڵکی حەق شێوێندرا.

- وە ئەهلی حەق ـیش ئازار دەدران و دەچەوسێنرانەوە.

• وە ناحەق و باطل ـیش بڵاوبوویەوە ، وە چوونە ناو یەک و گرژ بوونەوەی حەق و ڕاستی.

جا هەرکەسێک ویستبای کە بانگەشە بۆ شیوعیەت بکات یان ڕەخنە لە دین و هەڵگرانی بگرێت یان فاحیشە و داوێن پیسی بڵاو بکاتەوە یان بانگەشە بۆ هەر ئەفکارێکی کوفری بکات ئەوا دەیانگووت ئازادی بیرو ڕایە و فیکر و بیرۆکەکەش بۆ هەموان دابیندەکرا.

بەڵام کەسێک ویستبای حەق و ڕاستی بڵاوبکاتەوە و بانگەوازی بۆ حوکم کردن بە ئیسلام بکات ئەوا بە پێویستیان دەزانی کە لەناوی بەرن لەبەرئەوەی دەیانگوت توندڕەو و ئیرهابی و تیرۆریستە وە بڕیاری لەسەر دەدرا وە لەسەر ئەهلەکەیشی.

▪ ئا ئەمە هەندێکە لە بەروو بوومی ئەم عەلمانیە پیسە کە حوکمی وڵاتی موسلمانانی بە دەستە وە ووشە و ناوی بەرز کراوەتەوە بەسەر وڵاتاندا.

پاشان تیشکێک دەخەینە سەر هەندێک لەم شتە سادانەی کە پەیوەندی دارە بە عەلمانیەت و باسی دەکەین :

أ ) کاتێک ( عەلمانیەت ) سەریهەڵدا وەک مەبدەئـو بنەمایەک لە ڕۆژئاواوە لەسەر دەستی شۆڕشی فەڕەنسی کە مانا حەرفیەکەی بریتییە لە " بێ دینی " یان " جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت " ،

- بەڵام ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەم ووشەیە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی کە بناغەکەی فەرەنسیە و بریتییە لە :

( Secularite ) یان (Secularism)

واتە : ( اللادينية ) بێ دینی ، بەڵام پیاوێکی گاوری لوبنانی هەستا بە گواستنەوەی بۆ زمانی عەرەبی بە وەرگێڕانی بە مانای ( عەلمانیەت ).

بۆ ئەوەی موسلمانان ئەم مانایە قبوڵ بکەن ، ئینجا وا گومان ببەن کەوا گەڕانەوەیە بۆلای عیلم و زانست.

- نەوەک گەڕانەوە بێت بۆ مەبدەئـو بنەمای دوورخستنەوەی دین لە سیستەمی حوکم کردن و سیستەمی ژیان.

- وە بالفعل وە لە ڕاستیدا ئەم دەستەواژەیە بڵاوبوویەوە و ناسرا هەتاوەکو بەکاریان دەهێنا بەبێ شاردنەوە و نەهێشتنی یان ئینکاری و نکۆڵی لێ کردنی لە تەواوی وڵاتانی ئیسلامی ،

( وإنا لله وإنا إليه راجعون ) .

ب ) حوکمی ئیسلام چییە لەبارەی ( عەلمانیەت ) کە لە ڕابردوو باسکرا ؟

وەڵام : بێگومان عەلمانیەت مەبدەئـو بنەما و بیرو باوەڕی کافرانە ، وە سیستەمێکی کوفریە.

وە هەرکەسێک إعتقاد و باوەڕی پێی هەبێت یان بانگەوازی بۆ بکات یان پێیەوە پابەند بێت ئەوا کافر بووە ، لەبەرئەوەی بە سادەیی واتە ڕەتکردنەوە و قبوڵ نەکردنی سەدان ئایەتی قورئانی بەڕێزە وە ڕەتکردنەوەی سەدان فەرموودەی پێغەمبەرە ( صلی الله علیه وسلم ).

- وە ڕەنگە هەزارانیش بێت ، وە ڕەتکردنەوەی هەزاران ئەحکامی شەرعیە لەبەرئەوەی ئا ئەمە مەبدەئی کافرانە " هەروەکو چۆن بینیهان ".

هەروەها هەڵدەستێت لەسەر سنووردار کردنی ئیسلام لەناو چوار چێوەیەکی زۆر تەنگ و تەسک ، کە ئەویش هەندێک لە عیبادەت و شیعار و ئەخلاق دەگرێتەوە .

بەڵام ئەوەی کە دەبێت حوکم بکرێت و حەددە شەرعیەکان جێبەجێ بکرێت وە حوکم بە ئیسلام بکرێت لەسەر بواری ئابووری و ڕاگەیاندن وە هەروەها ئەو ئەحکامە شەرعیانە و ضەوابط ـەکانی ئیسلام کە ئیسلام دایدەنێت لەسەر کارو بارە جیاوازەکانی ژیان ئەوا هەموو ئەمانە ڕەفزکراو و پشتگوێخراوە بەپێی مەبدەئـ و بنەمای عەلمانی .

وە با ئاوڕێک بدەینەوە و سەرنج بدەین کەوا کاتێک ئەتاتورک هەستا بە ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی لە تورکیا لە ساڵی " 1942 ز " ، وە هەروەها ئینگلیزیش فەرمانڕەوایەتی میسریان دەکرد لە کاتی خۆیدا لەڕێی داگیرکاریەکی سەربازی.

جا ئەوەی ڕوویدا ئەوە بوو کە دادوەری شەرعی کە بەکرێگیراوی ئینگلیز بوو بە ناوی ( علي عبد الرازق ) ، هەستا بە نوسینی کتێبێک بە ناونیشانی ( الإسلام وأصول الحكم ) کە تێیدا باسی ئەوەی دەکرد کە :

( خیلافەت ) بیدعە و داهێنراو و وەهم و خەیاڵە، وە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە ، وە ئەو کارەی کە لە ئەستۆی پێغەمبەر بوو ( صلى الله عليه وسلم ) تەنها بریتی بوو لە بانگەوازی کردن بۆلای الله نەوەک حوکم کردن.

- وە ئەوەی کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەنجامی داوە لە جیهاد کردن و فەتح کردنی دوورگەی عەرەبی و حوکم کردن بە ئەحکامەکانی ئیسلامی شتێک نەبووە کە لە دین ـدا هەبێت، بەڵکو ئەمە لە پێناوی حوکم کردنێکی دونیایی بووە وە بۆ پێکهێنانی پادشایەتی بۆ شەخصی خۆی بووە لەمە زیاتر نەبووە ... هتد.

" ئەمە باوەڕو قسەی ئەو کافرەیە ، ( قاتلهم الله ) الله تعالى بیانکوژێت "

وە كاتێک كەوا داگیركاری ئینگلیز فەرمانڕەوایەتی میسریان دەكرد لەكاتی خۆیدا ئەوا زانایانی ئەزهەری ( ئەو كات ) ئەم هەلەیان قۆستەوە هەلی غیاب و ئامادە نەبوونی نێردراو سامی بەریتانی پاشان هەستان بە دادگایی كردنی ( علي عبد الرازق ) ـی ناوبراو وە شەهادەی ( العالمية الأزهرية )ـیان لێ سەندەوە كە بە دەستی هێنابوو ،

ئەمە ئەو كارە بوو كە ئەزهەری ئەوكات توانی ئەنجامی بدات.

وە موفتی ئەو وڵاتە لەكاتی خۆی ، بەناوی ( الشيخ محمد بخيت ) هەستا بە نوسینی كتێبێكی گەورە لەبارەی وەڵامدانەوەی موجریمی ناوبراو ، وە ڕوونی كردەوە لەسەر وەڵامدانەوەی ئەوەی كە ئەو باسی كردووە ( علي عبد الرازق ) باسی ئەوەشی كرد كە ئەو مورتەد بۆتەوە لە ئیسلام.

- وە باسی ئەوەشی كرد كە ئەوەی ئەو بانگەشەی بۆلای دەكات إنكاری و نكۆڵی كردنی سەدان ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەرە وە هەروەها ئیجماعی زانایان.

- وە ڕەفز كردنەوە و ڕەتكردنەوەی زۆربەی ئەحكامەكانی ئیسلامە.

- بەڵام زۆر بەداخەوە دەرس و وانەیان فێری فەرمانڕەواكان دەكرد وە فشاری زۆریان دەخستە سەر زاناكان بۆ ئەنجامدانی وانە وتنەوە ، وە لەوانیش هەبوو بە ئارەزووی خۆیان بە چاودێری كەسانی بەكرێگیراو كە هەموو پیشەكەی تەنها بەرگری كردن بوو لە فەرمانڕەواكان ، وە دەركردنی چەندەها فەتوا ئەو فەتوایەی كە لەگەڵ باطلەكەیان دەگونجا ، وە پێدانی شەرعیەت لەسەر هەموو ئەو شتانەی كە پێچەوانەی ئیسلامە.

- هەتاوەکو بارو دۆخەکە گەیشت بەوەی بە ئامادە بوونی شێخێکی ئەزهەر لە کاتی خۆی بەناوی ( محمد سيد طنطاوي ) بە ڕازی کردنی وەک وەفایەک بۆ " قسطنطين " بە گەڕانەوە بۆ نەصڕانیەت وە ئەمەش وەک پارێزگاری کردنێکە لەسەر یەکگرتوویی نیشتیمانی " الوحدة الوطنية " !

- پاشان هەڵستا بە دەرکردنی کارێک بۆ شێخ " فوزي الزفزاف " بە موافەقە کردن و ڕازی بوون لەسەر بەڵگەنامەی دەستەبەر کردنی حەق و ماف بۆ گاوڕەکان بە تەبشیر کردن و بڵاوکردنەوەی باطلەکەیان وە هەڵگەڕانەوەی موسلمانان لە دینەکەیان.

*وە ئەوەی کە باسمان کرد دڵۆپێکە لە دەریایەک* وە هەزاران نموونەی هاوشێوەی ئەمە هەیە ، وإنا لله وإنا إليه راجعون ...

## ∲ وانـەی بـیســـت و هـەشت ( 28 ) ∲

( لە وانەکانی ڕابردوودا باسی مەبدەئـو بنەمای عەلمانیەتمان کرد ، ئەو عەلمانەتیەی کە پێکهاتووە لە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ، وە هەموو ئەوانەشی کە کراوەتە یاسا لەلایەن ئەم سیستەمە طاغوتیەوە ... )

( وە بۆ ئەم وانەیەش ئەم باسەی خوارەوە تەواو دەکەین : )

⊖ ② دیموکراسی ( الدیمقراطیة ) :

دیموکراسی چییە ؟

دیموکراسی : بریتییە لە سیستەمێکی کۆنی یۆنانی لە سیستەمی حوکم کردن ـدا.

- بەم واتایە دێت : حوکم و بڕیاری گەل بۆ گەل لە ڕێگای نوێنەرەکان (کاندیدەکان) کەوا لەلایەن کۆمەڵێک لە گەلەوە هەڵیاندەبژێرن وەک نوێنەرێک بۆ خۆیان.
- وە ئەویش لە ئێستادا پێی دەگوترێت : ( ئەنجومەنی گەل ) یان ( پەڕلەمان ).

وە لێرەدا ڕەنگە کەسێک بێت و بڵێت : عەیب و ناتەواوی چییە لەم کارەدا ؟ وە ئایا لەم کارەدا لە چ شتێکدا پێچەوانەی ئیسلامە ؟!

وە ئێمەش بە یارمەتی الله تعالی دەڵێین :

بەڕاستی ئاینی ئیسلام داندەنێت بەوەی کە دەبێت خەڵک نوێنەرانێک بۆ خۆیان دابنێن یان نوێنەرانێک کە کێشە و گرفتەکانیان بەرز بکەنەوە بۆلای وەلی ئەمرەکان، وە هەروەها ئیسلام داندەنێت بە مەبدەئـو بنەمای شوڕا.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ } واتە : وە کارو باری نێوانیان بە پرس و مەشورەتە [ سورەتی الشوری : 38 ــ تەفسیری پوختە ]

- وە هەروەها پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) لەم ڕووداوانەی کە ڕوویدەدا ڕاوێژی بە خەڵک و هاوەڵەکانی دەکرد.

- وە هەروەها خەلیفەکانی راشیدون لە دوای خۆی ڕاوێژیان دەکرد ، وە زانایان قسەیان لەم بارەوە کردووە لە کتێبەکانی ( السیاسة الشرعیة ) لە ( ئەهلی الحل والعقد ).

بەڵام لێرەدا ئیختیلاف و ناکۆکیەکی بنەڕەتی هەیە لە نێوان شوڕا و ڕاوێژ لە ئیسلام ـدا وە لە نێوان دیموکراسی.

▪ جا لە دیموکراسی ـدا حوکمەکان لە کۆتاییدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ نوێنەرەکان ( کاندیدەکان )ـی گەل هەتا ئەگەر هاتوو ( ئەم حوکم و بڕیارانەی کە دەری ئەکەن ) دژ بوو لەگەڵ شەرعی الله سبحانه وتعالی.

بەڵکو لەڕاستیدا حەق و مافی نوێنەرەکانی گەل ( لەلای ئەوان ) :

- إلغاء کردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی حوکم کردنە بە شەریعەتی ئیسلامی ئەگەر جێگیریش بوو.

- چونکە بەڕاستی سیستەمی دیموکراسی ڕەچاوی گەڕانەوەی کۆتایی دەکات لە تەشریع و یاسا دانان ـدا بۆ نوێنەرانی گەل ، وە ڕەچاوی ئەوە ناکات کە دەبێت شەرعی الله تعالی حوکم و بڕیاری خودی خۆی جێبەجێ بکرێت.

بەڵام شوڕا و ڕاوێژ ( الشوری ) لە ئیسلام ـدا هیچ دەقێکی شەرعی ڕەتناکاتەوە و هەڵناوەشێنێتەوە لە کتێبی الله یان سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم )، بەڵام لە پەرلەماندا ڕاو بۆچوونەکان وەردەگرن ، ئەو ڕاو بۆچوونەی کە هیچ دەقێکی شەرعی تێدا نییە یان ئیجماع .

بەڵام شەرعی الله سبحانه وتعالی ئەوا بۆ هیچ کەسێک نییە کە ڕاو بۆچوونی خۆی پێشبخات بەسەر شەرعدا نە لە ڕێگای نوێنەرەکان وە تەنانەت دادوەر و فەرمانڕەوا خۆیشی هەرگیز بۆی نییە.

جا ئەم شەرع و بەرنامەیەی کە بەرزە ئەوا شەرعی الله تعالی ـیە بە إعتباری ئەوەی کە ئێمە بەندەی الله سبحانه وتعالی ـین ، وە بڕواداریین بە شەرعەکەی ، وە جێبەجێکاری فەرمانەکانی الله سبحانه و تعالی ـین.

الله تعالی دەفەرموێت : { وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ }

واتە : وە ( فەرمانمان پێ کردی ) کە حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی کە خـودا ناردوویەتیە خوارەوە و شوێن حەزو ئارەزوویان نەکەوی وە وریا بە لێیان لەوەی بت ترازێنن لە هەندێ لەوەی خـودا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت ، ئینجا ئەگەر ئەوانە ڕویان وەرگێڕاو سەرپێچیان کرد ئەوە بزانەو دڵنیابە خـودا ئەیەوێ بەهۆی هەندێ لە تاوانەکانیانەوە سزایان بدات و تووشی زیانیان بکات بێگومان زۆر لە ئادەمی یەکان سەرکەشن و لە سنووری خـودا دەرچوون [ سورەتی المائدة : 49 ــ تەفسیری پوختە ]

جا کەواتە پیشەی فەرمانڕەوا لە ئیسلام ـدا بریتییە لە حوکم کردن بەو قورئانەی الله دایبەزاندووە ، هەروەکو چۆن الله عز وجل لەو ئایەتەدا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کرد ( صلى الله عليه وسلم ) بە صیفەتی ئەوەی کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) یەکەمین فەرمانڕەوایە بۆ موسلمانان ، بەڵام ئەگەر فەرمانڕەوا حوکم و دادوەری نەکرد بەوەی الله سبحانه وتعالى کردوویەتیە شەرع و بەرنامە ئەوا ئەم کەسە کافرە.

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} واتە : وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خـودا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێ باوەڕن و موسوڵمان نین [سورەتی المائدة : 44 ــ تەفسیری پوختە]

- وە ئەم بەڵگەیەی کە لە پێشووتر باسکرا کوفری ئەو کەسانەی ڕوونکردەوە کە حوکم و دادوەری بە غەیری شەرعی الله سبحانە وتعالی دەکەن یان یاسا و بەرنامەیەکی نوێیان داناوە کە پێچەوانەی شەرعی الله سبحانە وتعالی ـیە .

- کەواتە شورا و ڕاوێژ لە ئیسلام ـدا لەم کارو بارانەوە دێت کە هیچ دەقێکی شەرعی تێیدا نییە ، بۆیە پێچەوانەی کتێبی الله یان سوننەتی پێغەمبەری خـودا ناکات ( صلی الله علیە وسلم ) یان ئیجماعێکی جێگیری زانایان .

- بەڵام دیموکراسی پابەندی هیچ شتێکی دیاری کراو نابێت ، جا ئەگەر نوێنەرانی گەل هاوڕا بوون و ڕێککەوتن لەسەر هەر قانون و یاسایەک یان یاسا دانانێک ئەوا دەبێت گەل هەمووی پابەند بێت پێیەوە هەتاوەکو ئەگەر بە تەواوی پێچەوانەی شەرعی الله سبحانە وتعالی ـی دەکرد . " والله المستعان "

( ئومێد دەکەین بە جوانی سەرنج بدەن لە جیاوازی نێوان شورِا و دیموکراسی ... )

## ∮ وانـەی بـیســـت و نـۆ ( 29 ) ∮

( قسەکانمان لەبارەی دیموکراسی و سیستەمەکەی تەواو دەکەین ، إن شاء الله : )

لە ئیسلام ـدا دەبێت شەرعیەت و بەرنامە و ڕەوایەتی بەرز لە حوکمەکاندا بۆ کتێبی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی بێت ( صلی الله علیه وسلم ).

⛔ جا ئەگەر کەسێک بەرهەڵستی و دژایەتی شتێک بکات لە قورئان و سوننەت ، ئەوا مورتەد دەبێتەوە وە ئەو شتەی کە بۆی دەچێتەوە دەبێتە شتێکی باطل و پووچ .

▪ بەڵام لە دیموکراسی ـدا ئەوا شەرعیەت و بەرنامە و ڕەوایەتی بەرز دەبێت بۆ نوێنەرەکانی گەل بێت نەوەک بۆ شەرعی الله تعالی.

بەڵکو ئەگەر یەکێک داوای مافی خۆی دەکرد بە جێبەجێ کردنی شەرعی الله سبحانە وتعالی ئەوا ئەوان کارەکە بە پێویست دەکەن بە گەڕانەوە بۆلای ( ئەنجومەنی نوێنەران ).

▪ جا ئەگەر ئەنجومەنی گەل یان ئەنجومەنی نوێنەران موافق و هاوڕا بوون لەسەر جێبەجێ کردنی شەریعەت ئەوا ئینجا ئێستاکەش دەڕوانن و سەیر دەکەن لە گونجان و شیاویەتی جێبەجێ کردنی شەرعەکە.

▪ بەڵام ئەگەر ڕەفزیان کردەوە و ڕازی نەبوون ئەوا لەم کاتەدا هاوڕا نەبوونە و ڕێکنەکەوتوونە لەسەر جێبەجێ کردنی شەریعەت ، بۆیە ئەوان ئەنجومەنی نوێنەران دەکەنە شوێنی دەستەڵات و بڕیاردان کە بە بەرزتری دادەنێن لە دینی الله سبحانە وتعالی ، کە لەم ئەنجومەنەدا مۆڵەت دەدەن و ڕێگە دەدەن کە ئایا شەریعەت حوکم بکات یان حوکم نەکات ..!

بۆیە لێرەدا نموونەیەکی سادە دەهێنینەوە :-

□ گفتوگۆیەک کراوە لەگەڵ دکتۆر أسامة الباز کە ڕاوێژکارێکی سیاسیە بۆ (الرئيس الجمهورية) سەرۆک کۆماری لەکار لابراو لە گۆڤاری " الأهرام العربي " لە بەرواری ( 2004/1/17 ) کە گفتوگۆکەش بریتیە لەمانەی خوارەوە :

* پرسیار : ئەی دکتۆر ئوسامە ئایا ئازادکردنی جەماعەتە ئیسلامیەکانی ئەم دواییە ئایا ئەمە تەعبیر دەکات لە بەرژەوەندی نێوان ڕژێم و جەماعەتە ئیسلامیەکان ؟

* لە وەڵامدا ووتی : نا .. نا ، لەم کارەدا ناکرێت سەیری بابی بەرژەوەندی بکەین ، وازم لێ بهێنە لێرەدا ئاماژە دەکەم بەوەی کە ڕەزامەندنی نییە لەم شوێنەدا بۆ بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێکخراوە سیاسیەکان لە دەرهاوێژەکانی دینی لەبەر ژمارەیەک هۆکار :

– یەکەم : لەم شوێنەدا بەشێک لە دانیشتوانی میسر لە ڕیزی ئاینی مەسیحیەت دانە و بایەخی پێ دەدەن .

- وە دووەم : هەندێک لە جەماعەتە ئیسلامیەکان وە لەوانیش " الإخوان المسلمون " دەڕوانن بەوەی کە الله خۆی سەرچاوەی دەستەڵاتە نەوەک ئوممەت ، وە ئەوانیش ڕەفزی فیکرە و بیرۆکەی دەستور و یاسای دانراو دەکەنەوە و پشت دەبەستن بە دەستوری الله.

بەم شێوەیەش لەم شوێنەدا پێویستی بە دەستورێکی ئیجابی نابێت بەگوێرەی ئەوەی کە ئەوان سەیری ئەکەن و لێی دەڕوانن ، وە لەبەر ئەمەش لە داهاتوویەکی نزیک ئەم کارە دەبێتە شتێکی غەریب و نامۆ بۆیە دەبێت مامەڵەی سیاسیانە بکرێت لەگەڵ ئەم کومەڵ و گرووپانە کە ڕەفزی دەرهاوێشتە بناغەییەکان دەکەن بۆ کاری سیاسی.

- " وە بە گوێرەی ئەم ڕوونکردنەوە ئەوا میسر ڕێگا نادات بە دامەزراندنی حیزبەکان لەسەر ئەساسی دینی "

----------------------------

کەواتە ئەم قسانەی کە لەم پیاوە عەلمانیە وەردەگیرێت " خاوەنی پێگەی ناسراو لە ڕژێمی فەرمانڕەوای لەناو چوو " بریتین لەمانەی خوارەوە :-

① ناوبراو ڕوونی کردەوە کە جەماعەتە ئیسلامیەکان باوەڕیان هەیە بەوەی کە الله خۆی سەرچاوەی دەستەڵاتەکانە نەوەک ئوممەت .

② لەکاتێکدا ئەو و هاوشێوەکانی لە عەلمانیەکان باوەڕ دەهێنن بەوەی کە ئومەت خۆی سەرچاوەی دەستەڵاتەکانە نەوەک الله سبحانە وتعالی .

③ ( لەلای ئەوان ) دەرهاوێژی ئەساسی بۆ کاری سیاسی بریتییە لە دان پیا نان بەوەی کە ئومەت سەرچاوەی دەستەڵاتەکانە نەوەک الله سبحانە وتعالی وە شەریعەتی ئیسلامی .

----------------------------

▪ کەواتە بە گوێرەی ئەوەی کە لە پێشەوە باسکرا ئەوا بەڕاستی سیستەمی دیموکراسی ( ئەنجومەنی گەل ) یان ( ئەنجومەنی نوێنەرانی ناوبراو ) دەکاتە خودا چونکە شەرع و یاسا و بەرنامە دادەڕێژن لە شوێنی الله ، بۆیە ئەوان بە ( ئەنجومەنی گەل ) دەڵێن ( دەستەڵاتی یاسا دانان ) .

▪ وە لێرەدا بێگومان فیکرە و بیرۆکەی دیموکراسی فکرەی کافرانە ، لەبەرئەوەی یاسا دانان دەگەڕێننەوە بۆ نوێنەرانی گەل نەوەک بیگەڕێننەوە بۆلای الله سبحانە وتعالی یان شەریعەتی الله عز وجل ، وە بەهۆی بانگەشەکارانی دیموکراسی ئەوا نوێنەرانی گەل وەک : " الأحبار والرهبان "ـیان لێ دێت.

⛔ ئەوانەی کە بەرنامە و یاسایان دادەنا بۆ یەهود و گاورەکان ، کە حەڕام ـیان بۆ حەڵاڵ دەکردن ، وە حەڵاڵ ـیان بۆ حەڕام دەکردن.

جا الله سبحانه وتعالی بەهۆی ئەنجامدانی ئەم کارە بە خودا ناویانی برد ، هەروەکو چۆن پێشتر بەدرێژی باسمان کرد ، لە شەرحی ئەم ووتەیەی الله تعالی کە لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ }

واتە : ( گاور و جوو ) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خـودا. [ سورەتی التوبة : 31 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە هەروەها پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) واتاکەی ئەمەی دەرخست و ڕوونی کردەوە بەوەی کە ئەوان حەڵاڵ ـیان لەسەر حەڕام دەکردن ، وە حەڕام ـیان لەسەر حەڵاڵ دەکردن ، ئەوانیش شوێنیان کەوتن " ئەوا بەم کارە بووە عیبادەت و پەرستنی ئەوان " ، هەروەکو چۆن لە پێشدا باسی ئایەتەکە کرا وە فەرموودەکەش ڕاڤەیەک بوو بۆی .

∮ وانــەی سیـ ـیـەم ( 30 ) ∮

بەڵکو بۆ ئەو بابەتەی کە لە پێشدا باسکرا " بە خێرایی " دەچین بەرەو ئەنجومەنی گەل ( مجلس الشعب ) لە میسرِ ـدا وە ئەم قانون و یاسایانەی کە کاری پێ دەکرێت بریتین لەمانەی خوارەوە :-

- حەڵاڵ کردن و ڕێگە دان بە مومارەسە کردن و ئەنجامدانی زینا بۆ هەموو پیاو و ئافرەتێکی باڵغ و پێگەیشتوو ، مادام لەم دوو لایەنە ( پیاو و ئافرەتەکە ) یەکێکیان إکراهـ و زۆرلێکردنی نەکردووەتە سەر کەسی بەرامبەر ، وە مادام ڕووی نەداوە کاسبی کردن و دەستکەوت بەسەر زیناوە (واتە : چووەتە شوێنی تایبەت بۆ زینا کردن).
- وە حەڵاڵ کردن و ڕێگەدان بە ئەنجامدانی کردەوەی قەومی لوط ، مادام لەم دوو لایەنە یەکێکیان إکراهـ و زۆرلێکردنی نەکردووەتە سەر کەسی بەرامبەر ...
- وە حەڵاڵ کردن و ڕێگەدان بە فرۆشتنی ئارەق لە ئوتێلەکان و لە هەموو شوێنە گەشتیاریەکان ...
- وە حەڵاڵ کردن و ڕێگەدان بە مامەڵە کردن بە ریبا ...

وە سزا دان نییە بەسەر هیچ کەسێک لە زیناکار و ئارەق خۆر یان یاری قومار کردن بە هەر سزایەک کە شەرع دایناوە ، وە هیچ تۆڵە و سزایەک نییە بەسەر کەسێک کە مورتەد دەبێتەوە و هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیسلام ...

⊖ بەڵکو پارێزگاری کردن بەسەر یەکگرتوویی نیشتیمانی پێشدەخسترێت بەسەر پارێزگاری کردن بەسەر ئیسلام ـدا ، هەروەک ئەوەی کە لە یاسای ژمارە " **34** " بۆ ساڵی " **1972** " هاتووە ...

▪ لە غەیری ئەمانەش لە زۆرێک لە کارو بارەکانی کافران پێچەوانەی دینی الله تعالی ـیە بە تەواوی ، وە ئەگەر بمانەوێت لەم بابەتە زۆر بکۆڵینەوە ئەوا بابەتەکامان زۆر لێ درێژ دەبێتەوە ( ئەوەنە کوفر و پێچەوانەی دینی تێدایە لەم ئەنجومەنانە )

---------------------------

جا لە بەرامبەردا لە جەزائیر ـدا هەمانە کە پەڕلەمان و حکومەت موافق بوون و ڕێک کەوتن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی وانە وتنەوە لە بابەتەکانی دینی لە پڕۆگرامەکانی فێرکاری ، وەک زیاتر لە ئاراستە کردن و ڕووکردن بۆ عەلمانیەت وە موحارەبە کردن و بەربەرەکانێ کردنی ئیسلام ( لە بەرواری **26** یونیو **2005** ) .

---------------------------

لە کاتێکدا لە أسبانیا زۆربەی ئەندام پەڕلەمانەکانی أسباني ڕێک کەوتن لەسەر قانون و یاسای ( الزواج المثلي ) واتە : هاوسەرگیری هاوڕەگەز بازی وە حەڵاڵ کردنی " التبني " ( التبني / واتە : لە خۆگرتنی منداڵ ، واتە : کەسێک کوڕێک یان کچێک بکاتە منداڵی خۆی ) بۆ ئەم زەواجە ...

" واتە : هاوسەرگیری پیاو لەگەڵ پیاو وە ئافرەت لەگەڵ ئافرەت "

▪ وە ئا ئەم موافەقە کردن و ڕێککەوتنە لەلایەن ( نوێنەرانی گەلەوە ) جێگیر کرا و ڕێکخستنی بۆ کرا بە دەرکردنی یاسایەک بۆ حەڵاڵ کردن و ڕێگەدان بەم کارە بە شێوەیەکی ڕەسمی ، وە سەرۆک وەزیرانی ئیسپانیا ( خوسیە ثباتیرو ) لێدوانێکی ـدا لەسەر ئەم کارە بەوەی کە :

▪ " ئەم کارە هەنگاوێکی نوێیە بۆ سەرخستنی ئازادی " وە اسبانیاش بەم کارەی دەبێتە سێیەم دەوڵەت بۆ ڕێگەدان بە زەواجی هاوڕەگەز بازی وە ( تبني )ـیش لە خۆ گرتنی منداڵ کارێکی ناوازەیە !!

-----------------------------

لە کاتێکدا لە سودان ئەنجومەنی گەل ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە نوێنەرایەتی یەکەم بۆ سەرۆک وەزیران کەسێکی گاورە " واتە : جون جارانج ـی بە هیلاک چووە " ...

وە ئا بام شێوەیە ئەگەر بگەڕێین و بکۆڵینەوە لەسەر ئەم کارە ئەوا بابەتەکەمان زۆر لێ درێژ دەبێتەوە .

- وە لە کۆتاییدا مەبەست لەمانەی باسکرا ئەوەیە کە فیکرە و بیرۆکەی دیموکراسی فیکرەی کافرانە.

▪ لەبەرئەوەی لە دیموکراسیدا هەڵدەستێت بە خودا کردن و پەرستنی نوێنەرانی گەل ( واتە : ئەندام پەڕلەمانەکان ) ، وە ئەمەش بەهۆی پێدانی حەق و مافی الله تعالی لە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ، وە دەبێت گەڕانەوەی یاسا دانانیش هەر بۆ ئەوان بێت نەوەک بۆ الله سبحانە وتعالی وە شەرعە پاکەکەی .

وە ئا ئەم دیموکراسیە دەستەڵاتدارەکان و ڕۆژنامەکان و کتێبەکان وە زۆر شتی تریش باسی دەکەن و پێی هەڵدەڵێن بەوەی کە دیموکراسی ( عەقیدەی ئوممەتە ).

هەروەکو چۆن لەکارلابراو حسني مبارك گووتی :

إن الديمقراطية هي عقيدة المواطن التي يجب ترسيخها بين الجماهير .

واتە : ئەم دیموکراسیە بریتییە لە عەقیدەی هاونیشتیمانیان کە پێویستە جێگیر بکرێت و بسەپێنرێت لە نێو جەماوەران و خەڵکەوە .

- وە ئێمەش دەڵێین ئەمە عەقیدەی کافرانە و پێچەوانەی شەرعی الله سبحانە وتعالی ـیە .

▪ بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن دیموکراسی باشترین سیستەمە :

ئەوا وەڵامیان ئەدەینەوە بە درێژی ( إن شاء الله ) جا لەبەرئەوەی زۆربەی نوێنەرانی گەل لە هاوەڵانی سەرمایە دارانن وە لە هاوەڵانی دەستەڵاتدارانن لە زۆربەی جاران ...

- جا ئەوان تێناپەڕن بەلای ڕاو بۆچوونەکانی گەل لە زۆربەی جارەکان ، بەڵام لەبەر ئەندازە و توانای دارایان وە لەبەر دەستەڵات و کاریگەری گەورەیان گەیشتوون بۆ ئەم شوێنە هەستیارانە ...

وە بە شێوەیەکی گشتی لەم بە دواداچوونەی کە ئێمە بۆمان کرد لەم نوسینەوەی ڕابردوودا لەسەر:

✓ ( مەفهوم و تێگەیشتن لە دیموکراسی ) تەنها لە لایەنی شەرعیەوە بوو .

✓ دوای ئەوەی کەوا زانیمان کە ( یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ) ئەمە تەنها حەق و مافی الله سبحانه وتعالی ـیە ...

وە بێگومانیش هەرکەسێک لەم کارەدا ناکۆکی لەگەڵ الله بکات ئەوا ئەم کەسە طاغوتێکە لە طاغوتەکان واجبە کوفر کردن پێی ...

وە باوەڕ بوون بەوەی کە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن بە تاک و تەنهایی هەر بۆ الله ـیە : { إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ } واتە : بێگومان بڕیار تەنها بۆ خـودایە فەرمانی داوە لەو ( خـودا ) هیچ شتێ نەپەرستن [ سورەتی یوسف : 40 ـ تەفسیری پوختە ]

جا لێرەدا واتای کارێکی گرنگ دەمێنێتەوە کە ئەویش بریتییە لە :

ئەم کارە چییە کە داواکراوە لە هەموو پیاو و ئافرەتێکی موسلمان لە بەرامبەر ئەم حەقە ئیلاهي ـیە ، وە لە بەرامبەر ئەم شیرکەی کە زۆربەی خەڵکی کەوتووەتە ناویەوە ؟

( ئەمەشیان لە وانەی داهاتوو ڕوون دەکەینەوە بإذن الله ).

∯ وانـەی سـی و یەک ( 31 ) ∯

ئەو داوا کراوانەی کە پێی داوا لە هەموو موسلمانێک کراوە بریتییە لەمانەی کە باسی دەکەین بە یارمەتی الله تعالی :-

① پێویستە کەوا مرۆڤی موسلمان بیرو باوەڕی وا بێت کە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەرام کردن حەق و مافی الله سبحانە وتعالی ـیە .

وە پێغەمبەریش ( صلی الله علیە وسلم ) گەیەنەر و پەیامبەرە لەلایەن الله تعالی ـەوە.

هەروەکو چۆن الله عز وجل دەفەرموێت : { وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ }

واتە : وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت گوێڕایەڵی بکرێت بە فەرمانی خـودا [ سورەتی النساء : 64 ]

وە هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا } واتە : وە ئەوەی پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) پێی دان وەریبگرن ، وە ئەوەی لێتانی قەدەغە کرد وازی لێ بێنن [ سورەتی الحشر : 7 ]

وە هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّهَ }

واتە : هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم ) بکات ئەوە بەڕاستی گوێڕایەڵی خـودای کردووە [ سورەتی النساء : 80 ــ تەفسیری پوختە ] .

② وە پێویستە کەوا مرۆڤی موسڵمان بیرو باوەڕی وابێت کەوا هەموو ئەو کەسانەی کە ناکۆکی و ڕکەبەرایەتی دەکەن لەگەڵ الله عز وجل لە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ئەوا ئەم کەسە طاغوتە ، واجبە کەوا کوفر بکرێت پێی و بێ باوەڕ بیت پێی ...

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا }

واتە : ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ ( کە قورئانە ) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە ( کە تەوراتە ) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خـودا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی

[ سورەتی النساء : 60 ــ تەفسیری پوختە ]

جا گەر سەرنج بدەین و وورد بینەوە لەم ئایەتەدا :

- { يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ } واتە : دەیانەوێت کە حوکم و دادوەری ببەنەوە بۆلای طاغوت .

■ لەبەرئەوەی طوغیانی کردووە و لە سنوور دەرچووە لە ئاست حەق و مافی الله ـدا لە حوکم کردندا.

- { وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ } واته : لەکاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە کوفر بکەن بە طاغوت و بڕوایان پێی نەبێت .

جا بەڕاستی الله سبحانه وتعالی فەرمانی کردووە پێمان بە کوفر کردن بەم طاغوتانە .

-------------------------------

هەروەکو چۆن لە پێشووتردا باسمان لەبارەی ئەم ووتەیەی الله تعالی کرد کە دەفەرموێت : { إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ } واته : بێگومان بڕیاردان تەنها مافی الله ـیە .

وە ئەم ووتەیەی الله تعالی کە لەبارەی یەهود و گاورەکانەوە دەفەرموێت :

{اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا} واته : ( گاور و جوو ) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خـودا ( ملکەچ و فەرمانبەرداریانن ، ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن ) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش ( بە کوڕی خـودا دەزانن ) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خـودایەک.

[ سورەتی التوبة : 31 ـ تەفسیری ئاسان ]

وە بەڕاستی پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) تەفسیری ئەم ئایەتەی کرد و ڕوونی کردەوە کە ئەوان زاناکان و عابیدەکانیان کردووەتە پەروەردگار لە شوێنی الله تعالی ، بەوەی کە ئەوان حەڕامیان بۆ حەڵاڵ دەکردن ، وە حەڵاڵیان بۆ حەڕام دەکردن ، ئەوانیش لەم کارەدا شوێنیان کەوتن.

وە باسی ئەم فەرموودەیەشمان کرد کە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : « إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ » واتە : بەڕاستی الله خۆی دادوەرە ، وە حوکمیش هەر بۆ ئەوە.

وە جگە لەمانەش ژمارەیەک فەرموودەی ترمان باس کرد ، وە مەبەست لەمە ئەوەیە کە هەموو موسلمانێکی پیاو و ئافرەت داوایان لێ کراوە کە کوفر بکەن و بێ باوەڕ بن بەم طاغوتانە کە ناکۆکی و ڕکەبەرایەتی لەگەڵ الله تعالى دەکەن لە تایبەتمەندیەکانی ئەو ، هەروەکو چۆن الله عز وجل دەفەرموێت :

- { وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ } واتە : لەکاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە کوفر بکەن بە طاغوت و بڕوایان پێی نەبێت .

جا بەڕاستی الله سبحانه وتعالى فەرمانی کردووە پێمان بە کوفر کردن بەم طاغوتانە .

-----------------------

③ وە پێویستە کەوا مرۆڤی موسلمان بەشداری نەکات لەم شتەی کە پێی دەگوترێت ( انتخابات ) " هەڵبژاردن " هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گەل ، وە هەروەها خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە ئەوەنەی ئەتوانێت ، لەبەرئەوەی ئەنجومەنی ناوبراو ( ئەنجومەنێکی شیرکیە ) ،

- وە ئەنجومەنی یاسا دانانە لە شوێنی الله تعالی ، وە ئەم ووتەیەی الله تعالی ئەمە پشت ڕاستدەکاتەوە و بەڕاستی دادەنێت کە دەفەرموێت : {أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ} واتە : ( ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بە بەرنامەی خـودا ) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەڕانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی خـودا مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت ( حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن ) [ سورەتی الشوری : 21 ـ تەفسیری ئاسان ]

جا الله سبحانە وتعالی ناویانی نا بە ( شرکاء ) واتە : چەند هاوبەشێک بۆ الله دادەنێن ( واتە : هاوبەشدانەر و موشریک ) .

∮ وانـەی سـی و دوو ( 32 ) ∮

④ پێویستە کەوا موسڵمانان هەموویان ( لە پیاوان و ئافرەتان ) بەشداری نەکەن لە کاری دادوەری وە هەموو ئەم شتانەشی کە پەیوەندیدارە بە دادگا و دادوەرەوە.

⊖ لەبەرئەوەی هەموو ئەم قانون و یاسایانەی کە کاری پێ دەکرێت پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامیە ( وە نەوەک ئەمەش هەتاوەکو یاساکانی باری کەسێتی و یاساکانی میراث وە هیچ قانون و یاسایەکیان موافق و هاوڕای شەریعەت نییە ، وە بەڵگەکانتان بۆ دەهێنینەوە بۆ ئەوەی لێی ئاگادار ببنەوە ... )

- جا درووست نییە بەجێ هێنان و فەرمانبەردار بوون بۆ ئەم دادوەری و بڕیارانە کە لە ژێر سێبەری ئەم یاسایانە دایە یان مامەڵە کردن پێی ، لەبەرئەوەی ئەم کارە دەبێتە إقرار کردن و دانپیانان بۆ ئەم قانون و یاسایانەی کە کافران دایانناوە ئەمە لە ڕوویەکدا ، وە لە ڕوویەکی تریش یارمەتی دانە لەسەر چەسپاندنی و جێبەجێ کردنی.

- وە الله سبحانە وتعالی نەهی کردووە لێمان لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە ، هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ } واتە : وە کۆمەکی یەکتری بکەن لەسەر چاکە و پارێزگاری ، وە کۆمەکی یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و دەست درێژی [ سورەتی المائدة : 2 ـ تەفسیری پوختە ].

بەڵکو زیاتریش لەم کارەدا کە ئاڵۆز بووە بریتییە لە ڕازی بوونی خەڵکی لەسەر چوونیان بۆ کۆلێژەکانی یاسا و مافەکان ، وە کار کردن بەم دادوەری و بڕیارانە ، کە ئەویش بەستراوەتەوە بە رزق و بژێوی خەڵکی بۆ ئەم کارە ، وە بەستراوەتەوە و لکاوە بە کارکردنیان و بەڕێوەبردنی بژێوی ژیانیان بەم کوفرە .

وە لێرەدا ئەوەی کە گونجاو و شایستەیە بۆمان قسەیەکی الشیخ إبن کثیر ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەگوازینەوە لەبارەی وەصفی " الیاسق " ، وە لەگەڵ ووتەی الشیخ العلامة أحمد شاکر ...

الحافظ إبن کثیر ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت : (( الله تعالی پێناخۆشی خۆی دەردەبڕێ و نکۆڵی دەکات دەربارەی ئەو کەسانەی کە لە حوکم و فەرمانی پتەوی الله تعالی دەردەچن ، کە هەموو کارێکی چاکە لەخۆی دەگرێت ، وە ڕێگرە لە هەموو کارێکی خراپە ، وە لایداوە لە هەموو هەواو ئارەزوو و زاراوەیەک کە کەسانێک دایاننابێ کە بەڵگەیەکی شەرعیان بە دەستەوە نەبێ لەلایەن خـوداوە ، هەروەکو چۆن خەڵکی سەردەمی نەفامی دادوەریان بەم گومڕایی و کارە نەفامانانیە دەکرد کە بە ڕاو بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆیان دایاننابوو ، وە هەروەها هەروەکو چۆن تەتارەکان حوکمیان پێ کردووە لە سیاسەتی پاشایەتیدا بە فەرمانی پاشاکەیان جەنگیز خان کە یاسق ـی بۆ دانابوون ، کە پێکهاتبوو لە کتێبێک لە کۆمەڵێک بڕیار کە لە چەندین یاسا و ڕێسا کۆی کردبووەوە و داینابوو ، لە ئاینی یەهودی و و گاور و ئاینی ئیسلام و ئاینی تریش ، وە فەرمان و بڕیاری زۆری تێدا بوو کە تەنیا بە هەواو ئارەزووی خۆی داینابوو ، پاش خۆی لەناو کوڕەکانیدا کرابوو بە یاسا و ڕێسایە کە پێشیان دەخست

بەسەر فەرمانی اللە و سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلی اللە علیه وسلم ) ، جا هەرکەسێک لەوان ئەم کارەی کرد ئەوا کافرە واجبە کوشتارکردن و شەڕکردن لەگەڵی تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکم و بڕیاری اللە و پێغەمبەرەکەی ، چونکە هیچ حوکمێک جگە لە حوکمی اللە و پێغەمبەرەکەی ( صلی اللە علیه وسلم ) قبوڵ ناکرێت کەم بێت یان زۆر بێت . ))

وە هەروەها دەفەرموێت : هەر کەسێک وازبهێنێت لەم شەرعە پتەوەی کە دابەزێندراوە بۆ سەر محمدی کوڕی عبداللە ( صلی اللە علیه وسلم ) کە کۆتایەمینی پێغەمبەرانە ، وە حوکم بباتەوە بۆ غەیری شەریعەتی ئیسلام لە یاسا نەسخ کراو و هەڵوەشێنراوەکان ، ئەوا کافر بووە ، جا حاڵی ئەم کەسە چۆن دەبێت کە حوکم و دادوەری دەباتەوە بۆ " الیاسا " وە بیخاتە پێش شەرعەوە ؟ هەرکەسێک ئەم کارە بکات ئەوا کـــــافر بووە بە یەک دەنگی موسڵمانان .

دەڵێم : وورد بەرەوە لە ووتەکەی الشیخ کە کردوویەتی ( رەحمەتی اللە لێی بێت ) کە چۆن هەرکەسێک حوکم و دادوەری بباتەوە بۆلای " الیاسق " ئەوا کافر بووە ، وە ئەم حوکمانەشی بە باطل دانا و هەڵیوەشاندەوە کە وەرگیرابوو لە ئیسلام کە لە " الیاسق "ـدا هەبوو بەهۆکاری ئەوەی کە ببوە یاسا داڕێژەر ( وە فەرمان و بڕیاری زۆری تێدا بوو کە تەنیا بە هەواو ئارەزووی خۆی دابنابوو ، پاش خۆی لەناو کوڕەکانیدا کرابوو بە یاسا و ڕێسایە کە پێشیان دەخست بەسەر فەرمانی اللە و سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلی اللە علیه وسلم )) پاشان وورد بەرەوە و سەرنج بدە کە چۆن باسی کوفری ئەو کەسەی کرد کە حوکم و دادوەری دەباتەوە بۆ شەرع و بەرنامە نەسخ کراو و

هەڵوەشێنراوەکان کە هەندێک یاسای تێدابوو و موافق و هاوڕای شەریعەتەکەی ئێمەش بوو .

وە ئەمەش قسەی أحمد شاکر ـە ( ڕەحمەتی اللە لێی بێت ) کە ڕوونکردنەوەی زیاتری تێدایە لەم بارەیەوە و دەفەرموێت : " وە ئا ئەمەش بووەتە دینێکی نوێ کە پێکهاتووە لە بنەما ئەساسیەکان ، کە حوکم و دادوەری بۆلای ئەگەڕێننەوە لەلایەن موسلمانان لە زۆربەی خاکی موسلمانان ، وە هەروەها حوکمی پێ ئەکەن جا جیاوازی نییە لەو شتانەی کە موافقە لە هەندێک لە ئەحکامەکانی شەریعەت وە لەو شتانەشی کە پێچەوانەیەتی ، بۆیە هەمووی باطل و دەرچوونە ، لەبەرئەوەی لەم شتانەی کە موافقی شەریعەتە موافقی دەبن لەبەرئەوەی ئاوا ڕێک دەکەوێت ، نەوەک لەبەر شوێنکەوتنیان بێت بۆ شەریعەت ، نە لەبەر گوێڕایەڵی کردنیانە بۆ فەرمانی اللە تعالی و پێغەمبەرەکەی ( صلی اللە علیە وسلم ) ، جا موافق بوون و پێجەوانە کردنیان هەردووکی ڕووچونە لەنێو گۆمی قۆڕاوی گومڕایەتیدا ، پێشەوایەتی خاوەنەکەی دەکات بۆ ناو ئاگر ، بۆیە درووست نییە بۆ هیچ موسلمانێک کە ملکەچی ئەم یاسایانە بێت یان پێی ڕازی بێت [ حکم الجاهلیة : 34-35 ].

- بەڕاستی موسلمانان هەرگیز تاقی نەکراونەتەوە بەم یاسایانە ، لەوەی زانیومانە لە مێژوویەکەیان ، " تەنها لەم سەردەم نەبێ " وە ئەویش لە خراپترینی سەردەمەکان بوو لە ستەم و تاریکایی ، وە لەگەڵ ئەمەش موسلمانان هەرگیز ملکەچ نەبوونە بۆ ئەم یاسایانە.

بەڵکو ئیسلام سەرکەوت بەسەر تەتارەکان پاشان تێکەڵیان کردن و خستیاننە نێو شەریعەتی ئیسلام ، وە ئەم شوێنەوارەشیان نەما ئەوەی کە کردبوویان بەهۆی ثبات و خۆڕاگری موسلمانان لەسەر دینەکەیان و شەریعەتەکەیان.

- وە بەوەی کە حوکمێکی خراپ و ستەمکارانە بوو کە سەرچاوەکەی لەلایەن دەستەی فەرمانڕەواکانەوە بوو ، لەم کاتەشدا هیچ یەکێک لە تاکەکانی ئومەتی ئیسلامی تێکەڵی ناو ئەم یاسایانە نەبوو بە فەرماندان و حوکم کردن بەسەریدا ، وە خۆشیان لێی فێر نەکرد ، وە نەوەکانیشیان فێری ئەم یاسایانە نەکرد ، جا ئەوە بوو کە بە خێرایی بووە هۆی نەمانی شوێنەواریان .

– ئایا نەتانیبنی ئەم وەصفە بەهێزەی الحافظ إبن كثير كردی " لە سەدەی هەشتەم " بۆ ئەم قانون و یاسایە دانراوانە کە دوژمنی ئیسلام جنكيز خان داینابوو ؟

– ئایا نەتان بینیوە بەم شێوەیەی کە وەصفی حالی موسلمانان دەکرێت لەم سەردەمەدا، لە سەدەی چواردەیەم ؟

تەنها یەک کۆمەڵ نەبێت کە لە ڕابرووددا ئاماژەمان بۆی کرد :

- کە ئەویش لە چینێکی تایبەت بوو لە فەرمانڕەوایەتی کە زەمەنێکی خێرا هات بەسەریدا جا ئەویش ئومەتی ئیسلامی تێکەڵ بوو لەگەڵی وە ئەم شوێنەوارانەیان نەما کە کردبوویان.

▪ پاشان موسڵمانان لە ئێستادا تووشی خراپترانی حاڵ و بارو دۆخ بوونە وە تووشی سەختترینی ستەمکاری بوونە وە بووتە تاریکایی بۆ موسڵمانان ، لەبەرئەوەی لە زۆربەی ئومەتانی ئیسلامی لە ئێستادا تێکەڵ بوونە لەگەڵ ئەم قانون و یاسایانەی کە پێچەوانەی شەریعەتە.

ئەم یاسایانەی کە هاوشێوەی ئەم ( الیاسق ) ـەیە ، کە درووستکراوی پیاوێکی کافری دەرخەری کوفر بوو .

▪ ئەم یاسایانە خەڵکانێک دایاننابوو کە خۆشیان پاڵ ئەدایە نێو دینی ئیسلام ( واتە : خۆیشیان بە موسڵمان ئەزانی ) ، پاشان فێری نەوە و کوڕانی موسڵمانانیان دەکردن ، پاشانیش باوان و کوڕەکانیشیان شانازیان دەکرد بەم یاسایانە.

▪ پاشان کارەکانیان دەگەڕێننەوە بۆ پەیڕەو کەرانی ئەم ( یاسق ـی سەردەمە ).

▪ پاشان ئیهانە و سوکایەتیان ئەکرد بەم کەسانەی کە پێچەوانەی ئەم یاسا دەستکردانەیان دەکرد ، وە ئەم کەسانەی کە بانگەوازیان دەکرد بۆ دەستگرتن بە دینەکەیان و شەریعەتەکەیان ناویان لێ دەنان بە کەسێکی (دواکەوتوو) و (ووشک) وە هاوشێوەی ئەمانە لە دەربڕینی جۆرەها ووشەی ناشیرین.

بەڵکو ئەم کەسانە دەستیان خستبووە نێو ئەم یاسایانەی کە مابوویەوە لە حوکم کردن لە یاسادانانی ئیسلامی کە مەبەستیان بوو بیگوازنەوە بۆ ( یاسق )ـە نوێیەکەیان ، جا جارێک بەهۆی لەسەرخۆیی و نەرم و نیانیەوە ، وە جارێکی تریش بەهۆی پیلان و فێڵێکی نوێوە ، وە زۆر جارانیش بەهۆی ئەم دەستەڵاتەی کە دەستیان بەسەردا

دەڕۆیشت ، وە ئەم یاسایانەیان بڵاوی دەکردەوە و لەبارەیەوە دەدوان وە بێ ئەوەی شەرم بکەن کە ئەوان کاردەکەن لەسەر جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت !

" لەگەڵ ئەمەدا " جا کەواتە ئایا درووستە بۆ هیچ یەکێک لە موسلمانان کە پەیڕەوی ئەم دینە نوێیە بکات وە سەرقاڵ بێت و گرنگی بدات بە یاسا دانانێکی نوێوە ؟

یان درووستە بۆ پیاوێکی موسلمان کە شوێنی ئەم دادوەری و بڕیارە بکەوێت کە لەژێر سێبەری ئەم ( یاسقی سەردەمە دایە ) وە کاربکات پێی ، وە پشتبکات لە شەریعەتە ڕوونەکەی ؟

گومان نابەم و بڕوا ناکەم کە پیاوێکی موسلمان هەبێت کە دینەکەی خۆی بە جوانی بناسێت وە ئیمان بە هەمووی دەهێنێت ( جملة وتفصيلاً ) ، وە ئیمان دەهێنێت بەوەی کە ئەم قورئانە الله تعالى دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) کە قورئانێکی پتەوی وایە کە هەرگیز ڕەفتار و گوفتاری باطل ڕووی تێ ناکات ، نە لەپێش خۆی و نە لەپاش خۆی، وە بەوەی کە گوێڕایەڵی الله تعالى بکات و گوێڕایەڵی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بکات بەوەی کە پێی هاتووە ( کە قورئانە ) واجبێکی قەتعی و بڕانەوەیەکە کە واجبیەتیەکەی لە هەموو حاڵ و کاتێک دایە.

گومان نابەم و بڕوا ناکەم کە مرۆڤی موسلمان بتوانێت ئەم کارە بکات ، تەنها کەسێک کە سوور بێت و دوو دڵ نەبێت و سەرنج نەدات بەوەی کە دەستەڵاتی ئەم دادگایانە لەم حاڵەتەدا باطل ـە باطلێکی بنەڕەتی ، پیاچوونەوە و ڕاستکردنەوە و ڕێگە پێدانی هەرگیز نایگرێتەوە .

- بەڕستی فەرمانی ئەم قانون و یاسا دانراوانە ڕوونە هەروەکو چۆن ڕۆژ ڕوون و ئاشکرایە .

- بۆیە موسلمانان ئاگادار و ووریا دەکەینەوە کە حوکمی ئەمانە لە کارکردن تێیدا کوفری بەواح و ئاشکرایە هیچ نهێنی و شاراوەییەکی تێدا نییە ، وە نە هیچ خولانەوەیەکی تێدایە ، وە عوزر نییە بۆ هیچ کەسێک کە خۆی پاڵ دەداتە نێو دینی ئیسلام ، " جا هەرکەسێک بێت " لە کارکردن پێی ، یان ملکەچ بوون بۆی ، یان إقرار کردن و دانپیانانی.

جا با پیاو ئاگاداری خۆی بێت ، چونکە هەموو مرۆڤێک لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی دەکرێت .

∯ وانـەی سـی و سـێ ( 33 ) ∯

(( بە یارمەتی الله تعالی بەردەوامین لەسەر ئەم داواكراوانەی كە لە هەموو پیاو و ئافرەتێكی موسلمان داوا كراوە لە بەرامبەر ئەم حەقە ئیلاهي ـیە ، وە لە بەرامبەر ئەم شیركانەی كە زۆربەی خەڵكی كەوتووەتە ناویەوە ، والله المستعان : ))

5 خەشم و ڕق لێ بوونەوەیان " واتە : ڕق و قینی هەبێت لە هەموو ئەم كەسانەی كە كەوتوونەتە ناو كوفرەوە " جا جیاوازی نییە فەرمانڕەواكان بێت یان ئەندامی لێژنەكانی یاسادانان بێت یان ئەندامانی ئەنجومەنی گەل بێت یان دادوەر بێت یان موحامی و پارێزەرەكان بێت ، هەموو ئەوانەی كە إقرار دەكەن و دان دەنێن بەم قانون و یاسایانەی كە كافران دایانناوە ...

وە ئەم ڕق و قینەش لێیان واجبە لەبەر ئەم ووتەیەی الله تعالی كە دەفەرموێت : { قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إبراهيم وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ...} واتە : بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێكی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون كە بە گەلەكەی خۆیانیان وت : بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش كە دەیان پەرستن لە جیاتی خـودا ، ئێمە باوەڕمان نییە بە ( ئایینی ) ئێوە ، وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و كینە بۆ هەمیشە تا كاتێك كە بڕوا بە خـودای تەنیا دەهێنن. [سورەتی الممتحنة : 4 ـ تەفسیری پوختە]

واتە : بەڕاستی بۆ ئێمە پێشەنگ و سەر مەشقێکی زۆر جوان هەیە لە ئیبراهیم ـەوە (سەلامی الله لێی بێت) وە لەوانەشی کە لەگەڵی بوون وە لە هەموو پێغەمبەران (صلوات الله وسلامە علیهم).

- لەم قسەیەیان کە بە گەل و قەومەکەی خۆیانیان گووت : ئێمە خۆمان لە ئێوە بەدوور و بێ بەری دەکەین وە لە هەموو ئەم شتانەشی کە لە شوێنی الله تعالی دەیپەرستن ، جا ئیعلانیان کرد و ڕایانگەیاند بەڕائەت و خۆ بەریکردن لە قەومەکەیان ، وە گوتیان : بێگومان ئێمە کافر و بێ باوەڕین پێتان ، وە بە هەموو ئەم شتانەشی کە ئێوە لەسەری دەڕۆن و پەیڕەوی لێ ئەکەن لە کوفر و بێ باوەڕی ، وە سەریهەڵداوە لە نێوان ئێمە و لە نێوان ئێوە دوژمنایەتی و ڕکەبەریەتی و ڕق و قین بۆ هەمیشەیی تاوەکو ئێوە بەردەوام بن لەسەر کوفر و بێ باوەڕی و هەتا ئیمانیش دەهێنن بە تاک و تەنهایی الله تعالی.

جا لەسەرمان واجبە کەوا چاویان لێ بکەین و پەیڕەویان لێ بکەین ( سەلامی الله لە هەموو پێغەمبەران بێت ) لە دوژمنیاتی و ڕق و قینە لەگەڵ هەموو کافران تاوەکو ئیمان بە تاک و تەنهایی الله تعالی دەهێنن.

وە هەروەکو چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیە وسلم ) دەفەرموێت : « أَوْثَقُ عُرَى الْإِيمَانِ الْحُبُّ فِي اللَّهِ وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ » واتە : بەهێز ترین و پتەوترینی دەست گری ئیمان خۆشەویستیە لە پێناوی الله وە ڕق لێ بوونەوەیە لە پێناوی الله .

⑥ نەبوونی یارمەتیدان و کۆمەکی کردنیان لەسەر کوفرەکانیان بە هەر ڕێگایەک بێت :-

لەبەر گشتگیر کردنی ئەم ووتەیەی الله تعالى کە دەفەرموێت : { وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ } واتە : وە کۆمەکی یەکتری بکەن لەسەر چاکە و پارێزگاری وە کۆمەکی یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و دەست درێژی.

[ سورەتی المائدة : 2 ــ تەفسیری پوختە ]

وە لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) کە دەفەرموێت: « إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ ، فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ » واتە : ئەمیر و فەرمانڕەوای واتان ئەخرێتە سەر ، کە شتی چاکیان لێ ئەبینن وە شتی خراپیان لێ ئەبینن ، جا ئەوەی بە دڵ ئەو تاوانانەی پێی ناخۆش بێت و ڕقی لێ بێتەوە ئەوە بەریە لە تاوان ، وە هەرکەسێکیش ئینکاری و نکۆڵیان لێ بکات ئەوا سەلامەتە لە تاوان ، بەڵام ئەو کەسە بەشدارە لە تاوانەکانیان کە بە تاوانەکە ڕازیە وە شوێنی تاوانەکە ئەکەوێت.

ووتەکەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کە فەرمووی :

- « وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ » واتە : ( بەڵام ئەو کەسە بەشدارە لە تاوانەکانیان کە بە تاوانەکە ڕازیە وە شوێنی تاوانەکە ئەکەوێت )

واتە : بەڕاستی ئەو کەسە لەناو چووە و فەوتاوە لەبەرئەوەی ڕازی بووە بەم مونکەر و تاوانانە وە بووەتە شوێنکەوتە بۆ ئەم فەرمانڕەوایە ، بە پێچەوانەی ئەم کەسەی کە نکۆڵیان لێ ئەکات ، وە هەرکەسێک ڕقی لە کردەوەکانیان ببێتەوە لەبەر ئەوەی پێچەوانەی شەرعە ئەوا ئەم کەسە نەبووەتە شوێنکەوتەی ئەم فەرمانڕەوایانە .

- قال النووي :

( معناه : من كره بقلبه ولم يستطع إنكارًا بيدٍ ولا لسانٍ فقد برئ من الإثم وأدى وظيفته ، ومن أنكر بحسب طاقته فقد سلم من هذه المعصية .. ومن رضي بفعلهم وتابعهم فهو العاصي " ).

واتە : مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە : هەرکەسێک ڕقی لێیان بوویەوە بە دڵی بەڵام نەیدەتوانی نکۆڵیان لێ بکات بە دەست و بە زمانی ئەوا بەری و دوورە پەرێز بووە لە تاوانەکەیان وە کارەکەی خۆی جێبەجێ کردووە ، وە هەرکەسێکیش نکۆڵیان لێ بکات بە گوێرەی توانای خۆی ئەوا سەلامەت بووە لەم تاوان و سەرپێچیانەی کە ئەوان دەیکەن ، بەڵام ئەم کەسەی کە ڕازی بووە بە کردەوەکانیان و شوێنیان کەوتووە ئەوا ئەم کەسە سەرپێچی کارە .

* دەڵێم : وە ئەگەر ئا ئەم خۆ بەریکردنە لە ئاست حەقی ئەم ئەمیر و فەرمانڕەوایانە بێت کە موسلمانی سەرپێچی کارن ، ئەوانەی کە هەندێک لە مونکەرەکان و خراپەکان ئەنجام ئەدەن ، هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی :

- « فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ » واته : شتی چاكيان لێ ئەبينن وه شتی خراپيشيان لێ ئەبينن.

ئەوا له بابی ئەولایه كه ئەم خۆ بەريكردن و دووره پەرێزيه له ئاست حەقی فەرمانڕەوايه كافرەكانەوه هەر هەبێت ، وه له هەموو ئەم كەسانەشی كه كەوتوونەته ناو كوفرەوه

∮ وانـەی سـی و چـوار ( 34 ) ∮

⑦ إنكار كردن و نكۆڵی لێ كردنیان بە ئەندازەی گونجان و توانایی :-

بەڵگەش لەسەری هەروەكو چۆن لە فەرموودەكەی پێشووتر باسكرا:

وە لەبەر ئەم ووتەیەی الله تعالی كە دەفەرمویێت : {كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ} واتە : ئێوە ( موسوڵمانان ) باشترین گەلێک بوون بۆ خەڵكی هێنرابێتە دی فەرمان دەدەن بە چاكە وە جڵەوگیری دەكەن لە خراپە ، وە بڕوا دەهێنن بە خـودا [سورەتی آل عمران : 110 ــ تەفسیری پوختە]

وە هەروەكو چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمویێت : « مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ » واتە : هەركەسێک لە ئێوە خراپەیەكی بینی ئەوا با بە دەستی بیگۆڕێت ، جا ئەگەر بە دەستی نەیتوانی ئەوا با بە زمانی ( إنكاری لێ بكات ) ، وە ئەگەر بە زمانیش نەیتوانی ئەوا با بە دڵـی ( پێی ناخۆش بێت و ڕقی لێی بێتەوە ) ، ئا ئەمەش لاوازترینی ئیمانە .

وعن ابن مسعود ( رضي الله عنه ) أن رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) قال : « مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلَّا كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ ، وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ، وَيَفْعَلُونَ مَا لَا يُؤْمَرُونَ ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ »

واتە : لە عبداللە کـوڕی مسعودەوە ( اللە لێی ڕازی بێت ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسـلم ) دەفەرموێت : هیـچ پێغەمبەرێک نییە کە اللە تعالی ڕەوانەی کردبێت لە ئوممەتانی پشووتر ئیللا لە ئوممەتەکەی پشتگیر و هاوەڵانێکی هەبووە کە شوێن ڕێباز و سوننەتەکەی کەوتوون وە جێ بەجێیان کردووە فەرمانەکەی ، پاشان لە دوای ئەوانەوە کۆمەڵە سەرکردەیەک پەیدا دەبن کە ئەوەی دەیڵێن و جێ بەجێشی ناکەن ، وە کردەوانێک دەکەن کە فەرمانیان پێ نەکراوە ، جا هەرکەسێک جیهاد و بەربەرەکانێیان بکات بە دەست ئەوا ئەو کەسە ئیماندارە ، وە هەرکەسێک جیهاد و بەربەرەکانێیان بکات بە زمانی ئەوا ئەو کەسە ئیماندارە ، وە هەرکەسێک جیهاد و بەربەرەکانێیان بکات بە دڵی ئەوا ئەو کەسە ئیماندارە ، وە لە دوای ئەوەوە ئیمانی نییە بە ئەندازەی دەنکە خەردەلەیەک .

وە هەروەها رسول اللە ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ »

واتە : بێگومان خەڵکی هەرکاتێک ستەمکاریان بینی ستەم دەکات و ئەمانیش بێدەنگ بوون و دەستیان نەگرت ، ئەوا نزیکە الله تعالی لەلای خۆیەوە سزا بۆ گشتیان بنێرێت و هەموویان عەزاب بدات .

ولما ذكر رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) الأمراء الظلمة قال : « إِنَّهُ سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ ، فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ ، وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ ، وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ ، فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ ، وَهُوَ وَارِدٌ عَلَيَّ الْحَوْضَ » واتە : کاتێک کەوا پێغەمبەری خـودا (صلى الله عليه وسلم) باسی فەرمانڕەوایە ستەمکارەکانی دەکرد و ئینجا فەرمووی :

بێگومان لەدوای منەوە چەندین ئەمیر و فەرمانڕەوا دێن جا هەرکەسێک بڕوا بە درۆکانیان بکات ، وە یارمەتیان بدات و کۆمەکیان بکات لەسەر ستەمەکانیان ، ئەوە لە من نییە وە منیش لەو نیم ، وە ئەو کەسە نایەتە لای من لە سەر حەوز ( بۆ ئاو خواردنەوە ) ، وە ئەو کەسەشی بڕوا بە درۆکانیان نەکات ، وە یارمەتیان نەدات لەسەر ستەمەکانیان . ئەوە لە منە وە منیش لەوم ، وە ئەو کەسە دێتە لام لەسەر حەوز ( بۆ ئاو خواردنەوە ) .

جا ئا ئەم بڕوا پێ نەکردن و یارمەتی نەدان و خۆ بەری کردنە لێیان لە بابی ئەولایە کە دەبێت هەر هەبێت لە ئاست حەقی ئەمیر و فەرمانڕەوایە کافرەکان .

⑧ دەعوە کردن و بانگەوازی کردن بۆ ڕوونکردنەوەی حاڵی کوفریان وە ووریا کردنەوە و ئاگادار کردنەوەی خەڵک لێیان :-

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ } واتە : ئەبێ لە ناو ئێوەدا کۆمەڵێک ببێت ، بانگەواز بکەن بۆ چاکە فەرمان بدەن بە هەموو چاکەیەک ، وە بەرگری بکەن لە هەموو خراپەیەک ، ئەوانە خۆیانن سەر کەوتوو .

[ سورەتی آل عمران : 104 ــ تەفسیری پوختە ]

وە بێگومان لە گەورەترینی مونکەڕ و خراپە بریتییە لە شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله تعالی ، جا واجبە کەوا نەهی و ڕێگری بکەین لێی.

وە هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « إِنَّ الدَّالَّ عَلَى الخَيْرِ كَفَاعِلِهِ » واتە : بەدڵنیاییەوە ڕێنیشاندەر بۆ چاکە پاداشتی وەک ئەو کەسە وایە کە چاکەکە دەکات .

⑨ واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت پێش هەموو ئەوانەی کە لە پێشووتر باسکرا واجبە لەسەری کەوا حوکم بە قورئان و سوننەت بکات لەسەر هەموو حاڵ و بارو دۆخەکانی ژیانی خۆی وە لەسەر هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی خۆی.

شاهێد لەسەر ڕاستیەتی ئەمە ووتەی الله تعالی ـیە کە دەفەرموێت : { فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا } واتە : نەخێر ( وانییە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن ) سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکییەکی نێوانیان ـدا ، لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچییەکی تەواو.

[سورەتی النساء : 65 ـ تەفسیری پوختە]

جا تەنها ئەمە نییە کە لەکاتی ڕوودانی کێشە و دووبەرەکی و ناکۆکیدا حوکمی شەرعی بدەین بەسەر کەسانی تردا ، کەچی بەسەر خۆشماندا حوکم بە شەرعی الله نەکەین .

بەڵکو واجبە کەوا حوکم بکەین بە شەرعی الله تعالی لەسەر خودی خۆمان پێش ئەوەی لە غەیری خۆمان جێبەجێی بکەین ، وە واجبە کەوا قبوڵی ئەمر و بڕیار و فەرمانی شەرعی الله بکەین لە هەموو شتێکدا ، جا جیاوازی نییە کە ڕێک دەکەوێت و کۆک دەبێت لەگەڵ بەرژەوەندیەکانمان یاخود لەگەڵی دژ دەبێت و بەریەک دەکەوێت .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ }

واتە : قسەی ئیماندااران تەنها ئەمەیە کاتێ بانگ بکرێن بۆ لای ( بەرنامەی ) خـودا و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەوەی بڕیار بدات لە نێوانیاندا ، کە دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵین وە هەر ئەوانەن ڕزگار بووان [سورەتی النور :51 ــ تەفسیری پوختە].

داوا دەکەین لە الله تعالی کە ئا لەم کەسانە بین .

وە ئا ئەمەش بریتی بوو لەوەی کە الله تعالی دەرووی لێ کردینەوە بۆ ئەوەی شارەزا بین لەم بابەتە .

والحمد لله رب العالمین

∮ وانــەی ســی و پێــنج ( 35 ) ∮

[ وەرزی سێیەم : بە تاک دانانی الله تعالی لە دۆستایەتی کردن و خۆشەویستی ـدا ]
↩ [ الفصل الثالث : إفراد الله بالولاء ]

الحمد لله ، والصلاة والسلام على رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) وبعد:

بێگومان لە پێشووتردا زانیمان کە تەوحید و بە تاک دانانی الله سبحانه وتعالی واتە:

- بە تاک دانانی الله تعالی لە درووشمەکان و قوربانی کردن و ڕێ و ڕەسمەکانی بەندایەتی .

- وە بە تاک دانانی الله تعالی لە یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن .

( وە گوتمان ) بێگومان نیزاع کردن و ناکۆکی کردن لەگەڵ الله تعالی ـدا لە شتێک لەمانەدا شیرکی گەورەیە.

- وە هەرکەسێک ناکۆکی لەگەڵ الله سبحانه وتعالی بکات لە شتێک لە تایبەتمەندیەکانی الله ئەوا ئەم کەسە طاغوتە ، واجبە کەوا کوفر بکرێت پێی، { وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلالاً بَعِيدًا } واتە : لەکاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە ( طاغوت ) نەبێت ، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوورو بێ سنوور [ سورەتی النساء : 60 ــ تەفسیری ئاسان ].

وە بێگومان هەرکەسێک شتێک لە تایبەتمەندیەکانی الله تعالی جێبەجێ بکات و ئەنجامی بدات بۆ غەیری الله ئەوا ئەم کەسە موشریک و هاوبەشدانەرە ، وە بێگومان ( لا إله إلا الله ) بەمانای بە تاک دانانی الله تعالی دێت لە عیبادەت و بەندایەتی کردن و پەرستنی ـدا ، وە کوفر کردن بە هەموو ئەم شتانەی کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرسترێت ، هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مَنْ دُونِ اللهِ ، حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ » واتە : هەرکەسێک ووتی : " لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ " ( هەر ئەوەنە بەس نییە ) ئینجا کافر و بێ باوەڕ بێت بە هەموو ئەو شتەی کە لە شوێنی الله ئەپەرسترێت ، ئەوا ئەو کاتە حەرام دەبێ ماڵەکەی و خوێنەکەی تەنها بە حەق و مافی خۆی نەبێ ، وە حساب و لێپرسینەوەشی لەسەر الله ـیە .

جا ئەگەر ئەمەمان زانی ئەوا بەڕاستی ماوەتەوە کە بشزانین ڕوکنی سێیەم لە ( الألوهية ) لە پەرستنی الله تعالی ـدا بریتییە لە :

( بە تاک دانانی الله تعالی لە دۆستایەتی کردن و خۆشەویستی ـدا ) بە مانای ئاراستە کردنی خۆشەویستی و دۆستایەتی دێت ( الولاء ) کە ئەویش ئەمانە دەگرێتەوە : ( خۆشەویستی و سەرخستن و گوێڕایەڵی کردن و پشتگیری کردن وە بە شێوەیەکی گشتی هەموو جۆرە نزیکیەک دەگرێتەوە ) بۆ الله سبحانە وتعالی ،

وە لە بەرامبەردا ( خۆ بەری کردن و دوژمنایەتی و ڕق و قین و پەیوەندی لەگەڵا بڕین دەگرێتەوە )

بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرسترێت ، وە بۆ هەموو ئەم کەسانەی کە کەوتوونەتە ناو شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله تعالی سەرەڕای جیاوازی جۆرەکانی هاوبەش دانەران، وە ئەم فەرمان و بڕیارەش ڕوون دەبێتەوە لە کتێبی الله تعالی ، وە سوننەتی پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) ، وە إجماعی زانایانی موسلمانان، جا ئەوەی کە لە قورئان ـدا هاتووە ئەوا الله تعالی دەفەرموێت : {إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ * وَمَن يَتَوَلَّ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ اللّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ} واتە : بێگومان دۆست و یارمەتی دەری ئێوە تەنها خـودا و پێغەمبەرەکەیی و بڕواداراننن ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنن و زەکات ئەدەن ، بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خـودا ★ وە هەر کەس خـودا و پێغەمبەر و ئیماندارا‌ن بکات بە پشتیوانی خۆی ئەوە بێگومان هەر کۆمەڵی خـودا زاڵ و سەرکەوتوون [سورەتی المائدة : 55-56 ــ تەفسیری پوختە].

ئا بەم شێوەیە دەبینین کە الله سبحانه وتعالی بە " صیغەی الحصر " دەفەرموێت : {إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ ... }.

جا بنچینەی دۆستایەتی و خۆشەویستی ( الولاء ) : (نزیک بوونەوە و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی کردن و سەرخستن و کۆبوونەوەیە) بۆ الله سبحانه وتعالی بە تاک و تەنهایی ، پاشان ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان لەدوای ئەمە پشتیوانی یەکتر بکەن ( لەسەر دینی الله سبحانه وتعالی )

وە لە دوای ئەمەشەوە پشتیوان و دۆستایەتی پێغەمبەری خـودا (صلی الله علیه وسلم) و ئیماندارا‌ن بکەن ، وە بەم شێوەیەش دۆستایەتی و خۆشەویستی ( الولاء ) دەورە دەدرێت بۆ الله سبحانە وتعالی وە بۆ پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) وە بۆ ئیمانداران ، لەبەرئەوەی خۆشەویستی و دۆستایەتی کردن بۆ الله سبحانە وتعالی ــیە وە لەسەر دینی الله ــیە عز وجل .

وە لە بەرامبەردا بەڕاستی ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان دەبێت دۆستایەتی و خۆشەویستیان بپچڕێنن لەگەڵ کافران لە پیاوان و ئافرەتان بە شێوەیەکی گشتی.

هەروەکو چۆن الله عز وجل دەفەرموێت : { لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً } واتە : نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لە جیاتی بڕواداران ، وە هەرکەسێک وابکات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خـودا ـدا نامێنێ مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێیان.

[ سورەتی آل عمران : 28 ــ تەفسیری پوختە ]

جا لێرەدا الله سبحانە وتعالی نەهی کردووە و ڕێگری لە ئیمانداران کردووە لەوەی کە دۆستایەتی و هاوڕێیەتی و هاوەڵیەتی کافران بکەن لە شوێنی ئیمانداران ، وە هەواڵی دا بەوەی کە هەرکەسێک ئەم کارە بکات ئەوە هیچ بەشێکی پەیوەندیی ئیمانی بە خـوداوە نییە ، واتە : بە دڵنیاییەوە بەهۆی ئەم کارەوە پەیوەندی پچڕاندووە لە نێوان خۆی و لە نێوان الله سبحانە وتعالی ، جا شتێک نەماوە لەنێوان خۆی و لەنێوان الله تعالی ـدا .

قال الإمام المفسر ابن جرير الطبري عند تفسير الآية : " وَمَعْنَى ذَلِكَ : لَا تَتَّخِذُوا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ الْكُفَّارَ ظَهْرًا وَأَنْصَارًا ، تُوَالُونَهُمْ عَلَى دِينِهِمْ ، وَتُظَاهِرُونَهُمْ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ، وَتَدُلُّونَهُمْ عَلَى عَوْرَاتِهِمْ ، فَإِنَّهُ مَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ ؛ يَعْنِي بِذَلِكَ فَقَدْ بَرِئَ مِنَ اللَّهِ ، وَبَرِئَ اللَّهُ مِنْهُ بِارْتِدَادِهِ عَنْ دِينِهِ ، وَدُخُولِهِ فِي الْكُفْرِ "

واتە : پێشەوای موفەسیری قورئانی پیرۆز إبن جریری الطبري (رەحمەتی الله لێی بێت) لەلای تەفسیر کردنی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت : وە مانای ئەم ئایەتە ، واتە : ئەی ئیمانداران نەکەن کافران بکەنە یارمەتیدەر و پشتیوان و سەرخەری خۆتان ، دۆستایەتیان بکەن لەسەر دینەکەیان ، وە پشتیوانیان بکەن بەسەر موسلمانان‌دا لە جێگای ئیمانداران ، وە ڕێنیشاندەریان بن بەسەر عەیب و عاری موسلمانان ، چونکە هەرکەسێک ئەم کارە بکات ، ئەوا هیچی شتێکی لەگەڵ الله ـدا نامێنێت ، واتە : بەهۆی ئەم کارەوە ئەوا بەری دەبێت لە الله ، وە الله تعالی ـش لەو بەری دەبێت ، بەهۆی مورتەد بوون و هەڵگەڕانەوەی لە دینەکەی ، وە چوونی بۆ ناو کوفرەوە .

وقال القرطبي ( رحمه الله ) في تفسير الآية : " أَيْ فَلَيْسَ مِنْ حِزْبِ اللَّهِ وَلَا مِنْ أَوْلِيَائِهِ فِي شيء " واتە : پێشەوا قورتوبی ( رەحمەتی الله لێی بێت ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت : واتە : جا بەهۆی ئەم کارەوە ئەم کەسە لە دەستە و حیزبی الله تعالی ـدا نییە وە نە لە هیچ شتێکدا لە دەستە و پشتیوانانیەتی .

کەواتە ئەم کەسە لە دەستە و حیزبی شەیتان و پشتیوان و سەرخەرەکانیەتی .

## ∮ وانـەی سـی و شـەش ( 36 ) ∮

ئیمان هێنان پێویستی دەبێت بە نەبوونی موالات و دۆستایەتی کردنی کافران، لەبەرئەوەی ئیمانداران دۆستایەتی یەکتر دەکەن لەسەر دینی الله سبحانە وتعالی وە خۆشەویستیان تیایدا دەبێت و یەکتری سەردەخەن لەسەر دینی الله تعالی ، جا لێرەدا ئیمانداران هەرگیز نابێت دۆستایەتی لەگەڵ کافران بکەن ، لەبەرئەوەی نابێت پەیوەندی کۆبوونەوەیان هەبێت لەگەڵ ئەم کافرانە.

- تەنانەت ئەگەر ئەم کافرانە لەم کەسانە بن کە لە نزیکترینی خەڵکی بوون بۆیان کە لە نەسەب و ڕەچەڵەک بێت وە یان ئەم کافرانە لە کەسو کاریان بن وە یان ئەم کافرانە لە عەشیرەت و هۆزەکەیان بن.

- جگە لەمەش ئیماندارانی پیاو و ئافرەت نابێت دۆستایەتیان بکەن لەبەر ئەوەی ئەم کافرانە لەسەر دینی الله سبحانە وتعالی نینە .

ئەمەش ڕوون دەبێتەوە لەم وتەیەی الله تعالی کە دەفەرموێت : { لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ }

واتە : کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خـودا و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خـودا و پێغەمبەری خـودا دەکەن ، هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن ، ئەوانە خـودا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە وە پشتیوانی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیەوە وە دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە خـودا لێیان ڕازی بووە ئەوانیش لە خـودا ڕازی بوون ، ئەوانە حیزبوڵڵان ئاگادار بن کە تەنها حیزبوڵڵا ڕزگار و سەرفرازن .

[ سورەتی المجادلة : 22 ـ تەفسیری پوختە ]

– جا لەم ئایەتەدا " الله تعالی هەواڵی ـدا کەوا ئیماندارێکت دەستناکەوێت کە دۆستایەتی کافرێک بکات و خۆشی بوێت ، جا هەرکەسێک خۆشەویستی هەبێت و دۆستایەتی کافرێک بکات ئەوا ئیماندار نییە ، وە کاتێک کە الله تعالی نەفی ئیمانی کردووە لە کەسێک کە دۆستایەتی باوکی و براکەی و هۆزەکەی بکات ئەگەر هاتوو لە کافران بوون ، جا هەرکەسێک دۆستایەتی کافرە دوور ترەکان بکات ئەمە ئەولاترە بەوەی کە ئەم کەسە هەر ئیماندار نییە " .

وە ئا ئەمەش ڕوون دەبێتەوە کەوا ئیمان هێنان بە الله و بە ڕۆژی دوایی کونابێتەوە لە کەسێک کە خۆشەویستی و دۆستایەتی بۆ کەسێک هەبێت کە ئەم کەسە دژایەتی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی دەکات ئیللا ئەم کۆبوونەوەیە دژی یەکترن و یەکێکیان ئەویتر هەڵدەوەشێنێتەوە.

وە ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم ئایەتەدا اللە سبحانە وتعالی باسی نزیکترینی نزیکەکان دەکات لە کەسوکار :

- { وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ } واتە : هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن.

وە ئا ئەمانە ئەگەر کافر بوون ئەوا درووست نییە خۆشویستنیان و دۆستایەتی کردنیان لەسەر کوفر هەتا مرۆڤی ئیماندار ئاگادار بێت لە دۆستایەتی کردنی کافران جا پلەی نزیکەیاتیان هەرچۆنێک بێت یان پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵیان و هەبوونی بەرژەوەندی لەگەڵیان هەرچۆنێک بێت.

پاشان اللە تعالی لەبارەی ئەم ئیماندارانەوە باسی کردووە کە دەفەرموێت :

- { أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ } واتە : ئەوانە خـودا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە وە پشتیوانی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیەوە.

- پاشان اللە تعالی لەبارەیانەوە باسی کردووە و دەفەرموێت : { أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ } واتە : ئەوانە حیزبوڵلان ئاگادار بن کە تەنها حیزبوڵلا ڕزگار و سەرفرازن .

جا ئا ئەمانە لە حیزب و کۆمەڵی اللە تعالی ـن ، لەبەرئەوەی ئەوان یەکیانگرتووە و کۆبوونەتەوە لەسەر دینی اللە سبحانە وتعالی نەوەک لەسەر هیچ پەیوەندی و یەکگرتنێکی تر .

هەروەها بەڕاستی لەمەیش ڕۆشن دەبێتەوە کە پەیوەستی و لکان بە تەوحید ـەوە بەهۆی نەبوونی موالات و دۆستایەتی کافرانەوە دەبێت :

لەم ووتەیەی الله تعالی کە لەبارەی نەوەی ئیسڕائیل ـەوە دەفەرمویێت :

{ لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ } واتە : نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوابوون لە بەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کرد و هەمیشە دەست درێژیان دەکرد [ سورەتی المائدة : 78 ].

تاکو دەگاتە ئەوەی کە الله تعالی دەفەرمویێت : { تَرَى كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ * وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَـكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ }

واتە : ئەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم )) زۆربەیان دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ، بێگومان زۆر بەد و خراپە ئەوەی کە پێشیان خست بۆ خۆیان ( کردویانە ) کە هۆی خەشم و قینی خـودا بوو لێیان وە ئەوانە لە سزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە ★ وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خـودا و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خـودا .

[سورەتی المائدة:80 -81 ــ تەفسیری پوختە]

– ا لێرەدا الله تعالى باسی لەبارەی ئەم کافرانەوە کردووە کە پێیان دەفەرموێت : {تَرَى كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ} واتە : دەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) زۆربەیان دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ...

وە ڕوونی کردەوە کە ئەم کارە مرۆڤ پێی کافر دەبێت ، وە پێی لە میلەتی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

- وە لەسەریان ڕێکخراوە بە مانەوەی هەمیشەیی لە عەذاب و سزا .

- جا الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت : { لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ } واتە : بێگومان زۆر بەد و خراپە ئەوەی کە پێشیان خست بۆ خۆیان ( کردویانە ) کە هۆی خەشم و قینی خـودا بوو لێیان وە ئەوانە لە سزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە.

- پاشان الله سبحانه وتعالى باسی ئەوەی کرد کە ئەوانەی کافر بوون بە هۆکاری دۆستایەتی کردنیان بوو بۆ کافران ، خۆ ئەگەر ئیمان هێنانیان هەبووایە بە الله تعالى و بە پێغەمبەر وە بەم پەیامەی کە بۆیان دابەزێنراوە ، ئەوا ئەم کافرانەیان نەدەکردە دۆست و پشتیوانی خۆیان.

- هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت :

{ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَـكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ }

واتە : وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خـودا و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خـودا .

∮ وانـەی سـی و حـەوت ( 37 ) ∮

له لێدوانێکدا لەسەر ئەم ئایەتەی کە لە ( وانەی ) پێشوتردا باسکرا :

الشیخ محمد نعیم یاسین فەرموویەتی :

- " الله سبحانه وتعالی ڕوونی کردەوە کە ئیمان هێنان بەستراوەتەوە بە نەبوونی دۆستایەتی و خۆشەویستی بۆ کافران ، جا چەسپاندنی موالات و دۆستایەتی کردن بۆ کافران نەهێشتنی ئیمان پێویست دەکات ، چونکە نەبوونی لازم پێویستی بە نەبوونی ملزوم دەبێت ، وە لە ڕوویەکی تریشدا الله تعالی تووڕەیی خۆی و مانەوەی هەمیشەیی لەناو سزا و عەذاب ـدا چەسپاندووە بەسەر ئەو کەسانەی کە دۆستایەتی کافران دەکەن.

- وە هەواڵی ـدا کە خۆشویستن و دۆستایەتی کردنی کافران هەرگیز لە ئیماندارێک ڕوو نادات ، چونکە ئەهلی ئیمان دژایەتیان دەکەن و دۆستایەتیان ناکەن.

- پاشان سەیر بکە چۆن الله سبحانه وتعالی دەریبڕیوە کە نەبوونی موالات و دۆستایەتی کردن بۆ کافران دەچێتە ناو مانای دوو شایەتی دانەکە ئەو دوو شایەتی دانەی کە ڕۆشنی کردەوە بە ئیمان هێنان بە الله و بە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وە بەم پەیامەشی کە بۆی دابەزیوە " .

(( جا ئیمای إبن القیم ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

" درووست نییە موالات و دۆستایەتی کردنی کافران مەگەر بە دژایەتی کردنیان نەبێت هەروەکو چۆن الله تعالی لەبارەی پێشەوا و خۆشەویستی یەک خـودا پەرستان دەفەرموێت ، کەوا بە قەومەکەی خۆی فەرموو : { قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ * أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ * فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ }

وتی : ئایا ئێوە دەزانن چی دەپەرستن ★ ئێوە و باو و باپیرە پێشووەکانتان ★ جا بەڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن جگە لە پەروەردگاری جیهانیان .

[ سورەتی الشعراء : ٧٥ ... ٧٧ ــ تەفسیری پوختە ]

بۆیە درووست نەبووە بۆ خلیل ـی الله هیچ جۆرێک لەم خۆشەویستی و دۆستایەتیە مەگەر بە تەحقیق کردن و هێنانەدی ئەم دژایەتی کردنە نەبێت کە کردی ، چونکە ولاء و دۆستایەتی نییە مەگەر بۆ الله نەبێت ، وە دۆستایەتی نییە مەگەر بە خۆ بەری کردن و دوورە پەرێزی نەبێت لە هەموو پەرستراوێک بێجگە لە الله.

الله تعالی دەفەرموێت : { وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ * إِلاَّ الَّذِي فَطَرَنِي فإِنهُ سَيَهْدِينِ * وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ }

واتە : وە کاتێ ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن ★ جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات ★ ئەو ( یەک خـودا پەرستی یە )ـی لەناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت تا بگەڕێنەوە سەری [ سورەتی الزخرف : 26 ... 28 ــ تەفسیری پوختە ].

واته : ئەم موالات و دۆستایەتی کردنە بۆ الله تعالى و خۆ بەری کردنەش لە هەموو پەرستراوێک بێجگە لە الله ئەمە ئەم ووشەیە بوو کە هێشتیەوە لەدوای خۆی کە پێغەمبەرانیش بە میراث دەیهێڵێنەوە و شوێنکەوتوانیشیان لە هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان ، کە ئەویش ووشەی " لا إله إلا الله " ـیە ، ئەو ووشەیەی کە پێشەوای یەک خـودا پەرستان بە میراث لەدوای خۆی بەجێی هێشت تاکو ڕۆژی قیامەت . ))

[ الجواب الكافي : ص213 ]

دەڵێم : کەواتە پەیوەستبوونی تەحقیق کردنی ( شهادة لا إله إلا الله وأن محمدًا رسول الله ) : بە نەبوونی موالات و دۆستایەتی کردنی کافران جێگیر کراوە لەم ئایەتەدا :

هەروەکو چۆن الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت : { وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاء } واته : وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خـودا و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر.

وە لە ڕووی ماناوە : موالات و دۆستایەتی کردنی کافران ، بەم واتایە دێت: خۆشویستنیان لەبەر کوفرەکانیان یان گوێڕایەڵی کردنیان لە کوفردا یان سەرخستنیان دژی موسلمانان ، یان کۆبوونەوە لەگەڵیان لە حیزب و تاقمە کافرەکانیان.

وە هاوشێوەی ئەمانە لە چەندین هاوشێوەی تری خۆ نزیک کردنەوە و خۆشەویستی و سەرخستن و یارمەتی دانیان لەسەر کوفر.

کە ئەمانەش پەیوەست دەبێت بە سەرخستنی کافران بەسەر موسلمانانەوە ، وە بڵاوکردنەوەی کوفرەکانیان ، وە ڕازی بوون پێی ، وە کۆمەکی و هاوکاری و یارمەتیدانیان لەسەر کوفرەکانیان ، وە نەبوونی إنکاری کردن و نکۆڵی کردن لێیان.

وە ئا هەموو ئەمانە بە کورتی و بە درێژی دژە لەگەڵ تەوحید و هەڵیدەوەشێنێتەوە ، لەبەرئەوەی تەوحید واتە ئیمان هێنان بە الله تعالی و کوفر کردن بە هەموو ئەم شتانەی کە لە شوێنی الله دەپەرسترێت ...

وە لەدوای ئەمەشەوە پێویستە کەوا إنکاری و نکۆڵی لەم کوفرە بکات و ناڕازی بێت پێی و نەبێتە سەرخەر بۆی ، وە نابێت خۆشەویستی هەبێت بۆ کافران ...

بە شێوەیەکی گشتی واتە : نەبوونی موالات و دۆستایەتی و پشتیوانی بۆ کافران ، وە پچڕاندنی هەموو جۆرە پەیوەندیەک لەگەڵیان ، یان بە هەر جۆرە وێنە و شێوازێک بێت کە تەعبیر بکات لەسەر ڕازی بوون بەم کوفرانەی کە کافران دەیکەن یان تەعبیر بکات لەسەر حۆشەویستنی یان سەرخستنی یان کۆمەکی و هاوکاری کردنی لەسەر ئەم کوفرانە.

- وە ئا بەم شێوەیە پەیوەست بوونێکی پتەو دەبینین لەنێوان ( ئیمان هێنان بە الله و تەحقیق کردن و هێنانەدی تەوحید ) وە لەنێوان ( دژایەتی کردنی کافران و نەبوونی دۆستایەتی و خۆشەویستی بۆیان ) ، وە بە تاک دانانی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران لە موالات و دۆستایەتی کردن .

- واتە : خۆشەویستی و سەرخستن و سۆزو بەزەیی و گوێڕایەڵی و یارمەتی و پشتگیری و کۆبوونەوە لەسەر دینی الله تعالى ... ، چونکە موالات و دۆستایەتی دەبێت لەسەر ( دینی ئیسلام بێت بە تەنها ) .

هەروەکو چۆن الشیخ عبد الرحمن کوڕی سعدي لە لێدوانێکی لەسەر ئەم ووتەیەی الله تعالى فەرموویەتی کە الله تعالى دەفەرموێت : { وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ } واتە : وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خـودا و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر ...

- جا الشیخ دەفەرموێت :

بەڕاستی ئیمان هێنان بە الله و بە پێغەمبەر و بەم پەیامەشی کە بۆی دابەزیوە واجب دەبێت لەسەر بەندە کە موالاتی پەروەردگاری بکات وە موالاتی دۆست و پشتیوانانی بکات ، و دژایەتی ئەم کەسانەش بکات کە بێ باوەڕن پێی و دژایەتی دەکەن.

- جا موالاتی الله تعالى و ئیمان هێنان پێی مەرجە کە نابێت دوژمنانی الله تعالى بکرێت بە دۆست و پشتیوان.

- وە ئەوانەی ئەم مەرجەیان لێ بەدی نەکراوە ، واتە : دژایەتی کردنی کەسێک کە بێ باوەڕە بە الله ، ئەوا لایان نەماوە ئەوەی کە بە مەرج گیراوە " واتە : ئیمان هێنان بە الله ".

- { وَلَـكِنَّ كَثِيراً مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ } واته : بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خـودا.

- واتە : دەرچوونە لە گوێڕایەڵی کردنی الله تعالى وە لە ئیمان هێنان پێی ، وە لە هۆی فاسق بوونیان و لە سنوور دەرچوونیان لەبەر موالات و دۆستایەتی کردنیان بوو بۆ دوژمنانی الله تعالى " .

∲ وانـەی سـی و هـەشت ( 38 ) ∲

بینیمان کەوا الله تعالی فەرزی کردووە لەسەر هەموو موسلمانان کە خۆیان دوورە پەرێز و بەری بکەن لە :

- ( کافران ، وە لەم خودا و پەرستراوە باطل ـانەی کە لە شوێنی الله تعالی دەپەرسترێت ، وە لە هەموو ئەم ڕێگا و ڕێبازە کوفریانەی کە کافران شوێنیان کەوتوون ) .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إبراهيم وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ... }

واتە : بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خـودا ، ئێمە باوەڕمان نییە بە ( ئاییینی ) ئێوە ، وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە خـودای تەنیا دەهێنن [ سورەتی الممتحنة : 4 ــ تەفسیری پوختە ].

جا لێرەدا الله سبحانه وتعالى ڕوونی کردەوە و فەرمانی پێیان کرد کە چاو لە ئیبراهیم بکەین و شوێنی بکەوین ( سەلامی الله لێی بێت ) بە صیفەتی باوکی پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ).

- وە ئەوانەشی کە لەگەڵی بوون : کە ئەوانە بوون لەسەر تەوحید شوێنی کەوتبوون ، وە ئا ئەم پێشەنگ و سەرمەشقەش بریتی بوو لەوەی کە بە قەومەکەی خۆیان ڕاگەیاند بەرائەت و خۆ بەری کردن لێیان :

- { إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ } واتە : کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خـودا.

جا تەبەڕایان کرد و خۆیان دوورە پەرێز کرد لە ( ئەزموونداران و پیاو ماقولە کافرەکان ، وە لەم هاوتا و خودا و پەرستراوە باطل ـانەی کە دەیانپەرستن لە شوێنی الله تعالى ).

- وە پێیان گوتن : { كَفَرْنَا بِكُمْ } أي : بدينكم الباطل وبطرقكم الكافرة التي أنتم عليها .

- واتە : ( بێ باوەڕین پێتان ) واتە : بێ باوەڕین بە دینە باطل ـەکەتان و بە ڕێگا کوفریەکانتان ئەو ڕێگایەی کە ئێوە لەسەرینە.

- وە پێیان گوتن : { وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ } واتە : وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە خـودای تەنیا دەهێنن.

- جا ئیعلانیان کردو پێیان ڕاگەیاندن بە دوژمنایەتی کردن و ڕق و قین و خۆ بەری کردنێکی تەواو لە بەرامبەر کافرەکان و خودا باطل ـەکانیان ، وە بەم بارو دۆخەیان و ڕێگا و ڕێبازە کوفریەکانیان تاوەکو ئیمان دەهێنن بە تاک و تەنهایی الله.

جا ئەگەر ئیمانیان هێنا بە تاک و تەنهایی الله تعالی وە وازیان هێنا لە کوفر کردن و لە دەرگاکان و هۆکارەکانی کوفر کردن ، ئەوا ئەم دوژمنایەتی و ڕق و قینەش نامێنێت و وەردەگەڕێت بۆ خۆشەویسی و دۆستایەتی کردن.

بەڵام لەبەر ئەوەی کەوا کافرن و بەردەوامن لەسەر کوفرەکانیان ئەوا دەبێت دوورە پەرێزی و خۆی بەری کردنێکی تەواو لێیان هەبێت ، وە بەیەک گەیشتنیش لەگەڵیان نییە لە ناوەڕاستی ڕێگاش ، لەبەرئەوەی ئیسلام و شیرک هەرگیز بەیەک ناگەن ، تەنها ئەگەر کافرەکە موسلمان بوو وە شیرک و هاوبەش بڕیاردانی لەخۆی داماڵاند ...

• یانیش موسلمانەکە مورتەد دەبێتەوە و مەیلی دڵی و خۆشەویستی بۆلای کافران دەچێت.

• یانیش واز لە شتێک لە دینەکەی دەهێنێت و ڕازی دەبێت پێیان .

کەواتە دەبینین کە الله سبحانه وتعالى فەرمانی پێمان کردووە بەوەی کە چاو لە ئیبڕاهیم بکەین ( سەلامی الله لێی بێت ) وە لە هەموو ئەم کەسانەشی کە لەم کارەدا شوێنی کەوتبوون.

کە ئەویش بریتی بوو لە خۆ بەری کردن لە کوفر و کافران و پەرستراو و خودا باطل ـەکان .

وە الله سبحانه وتعالی باسی ئیبراهیمی کردووە ( سەلامی الله لێی بێت ) بەوەی کە باوکی پێغەمبەرانە.

جا هەموو پێغەمبەران شوێنی ئەو کەوتوون لە نەوەکانی ئەمە لە ڕوویەک ، وە لە ڕوویەکی تریش بەڕاستی الله سبحانه وتعالی فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی دینەکەی.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ } واتە : پاشان نیگامان بۆ کردی کە پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکە چونکە پاك و ڕاست بوو بە هیچ جۆرێ لە هاوبەش دانەران نەبوو.

[ سورەتی النحل : 123 ــ تەفسیری پوختە ] .

وە ئەم ئایەتە پوخت دەکەینەوە لەمانەی خوارەوە :-

(1) واجبیەتی بەڕائەت کردن و خۆ دوورە پەرێز کردن لە کافران ، وە لە خودا و پەرستراو و هاوتایە باطل ـەکان ، وە لە هەموو ڕێگا و شواز و بەرنامەیەکی کافران.

- { إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ }واتە : کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خـودا.

② ئیعلان کردن و ڕاگەیاندنی بەڕائەت کردن لە کوفر و کافران کە ئەویش ئەو صیفەتە چاکەیە کە تێیدا واجبە شوێنکەوتنیان .

③ ئیعلان کردنی بەڕائەت کردن لە کوفر و کافران لە پێویستیەکانی تەوحیدە ( من لوازم التوحید ) ، لەبەرئەوەی تەوحید پێویستی دەبێت بە موالات و دۆستایەتی کردنی ئیماندارن و خۆشویستنیان و سەرخستنیان ، وە ڕق و قین لێ بوونەوە لە کوفر و کافران و دژایەتی کردنیان .

④ بەڕائەت و خۆ بەری کردن بە تەنها کورت نەکراوەتەوە بەسەر هاوتا و پەرستراوی کافران و خودا خەیاڵیەکان ، وە بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەڕائەت کردن هەیە لە کافران بۆ گەورە و پیاوە ڕیش سپیەکانیان ، وە بەم ڕێگا و ڕێبازانەی کە کافران دایاننناوە .

⑤ بۆ هیچ موسلمانێکی پیاو و ئافرەت نییە کە إقراری کوفر بکەن و دانی پیا بنێن یان مەوەدە و خۆشەویستی خۆیان دەربڕن بۆ کافران لەسەر کوفرەکانیان .

∮ وانــەی ســی و نـۆ ( 39 ) ∮

- کەواتە لەگەڵمان ڕۆشن بوویەوە گرنگیەتی بەڕائەت و خۆ بەری کردن لە کافران و خودا و پەرستراوە باطل ـەکان ، وە بەم بەرنامە و ڕێباز و ڕێگا جۆراو جۆرە کوفریانە.

- بۆیە بەڕاستی هەموو موسلمانێکی پیاو و ئافرەت هەست دەکات کەوا (هێرشەکانی فیکری جیهانی) ئەوەی کە بەردەوام دووبارەیان دەکردەوە لە (بانگەواز کارانی یەک گرتنی ئاینەکان) ، وە ( نزیک بوونەوەی نێوانی ئاینەکان ) وە (دان پیانان بە یەکتر) وە ( نەهێشتنی تەکفیر کردنی کافران ) وە هاوشێوەی ئەمانە ؛

موسلمانان ئەمەیان دانەناوە ئیلا ئەو کافرانە نەبێت کە تاکە مەبەستیان ڕووخاندنی دینی ئیسلام بووە ، وە مەبەستیان بووە کە موسلمانان بخەنە ناو دینی کافران بەهۆی نەهێشتنی بەربەستەکان لەنێوان ئاینی ئیسلام و ئاینەکانی تر ...

وە هەموو ئەمانەش بەهۆی درووشمە پیسە هەمە ڕەنگەکان بووە وەک :

- گفت و گۆی نێوان ئاینەکان .
- وە نزیک بوونەوەی نێوانی ئاینەکان .
- وە گفت و گۆی شارستانێتی .

وە هاوشێوەی ئەمانە .

وە ئەویش پێچەوانە کردنی بنچینەی دینی ئیسلامە ئەم بنچینەیەی کە کۆنابێتەوە لەگەڵ کوفر و ئەهلەکەی نە لە کەم و نە لە زۆر .

وە ئاینی ئیسلام نەفی و ڕێگری لەمە ناکات لە گونجانی مشتومڕ کردن لەگەڵ کافران ، وە ئیقامە حوججە کردن لەسەریان ، وە ڕوونکردنەوەی دینی ئیسلام بۆیان ، بەڵام ئەو هێرشە فیکریانە و موئتەمەڕ و کۆنگرانە کافران تەنها مەبەستیان پێی دەرهێنانی موسلمانان بووە لە دینەکەیان ، وە شل کردنەوەی جیاوازی لەنێوان ئیسلام و جگە لەویش لە ئاینە باطلـە فەوتاو و لار بووەوەکانە .

-------------------

وە لە ڕوویەکی تریشەوە ، ئەوا بەڕاستی لەسەر هەموو موسلمانێکی پیاو و ئافرەتە کە زۆر بەباشی بزانێت و عیلمی پێی هەبێت بە ( ڕێگا جۆراو جۆرەکانی کوفر ) .

چونکە دوژمنانی دینی الله تعالی گەلێک جار ڕێگای جۆراو جۆری پێچەوانەی ئیسلام دادەنێن بۆ ڕووخاندنی بنچینەکانی ئیسلام ، وە ئا ئەم ڕێگایانەش زۆر بە جوانی دایڕازێننەوە و دەینەخشێنن و ناوی لێ دەنێن بە جۆرەها ناوی نوێ تاوەکو بشێوێت و تێکەڵ بێت بەسەر خەڵکەوە ...

وە لە ئامانج و مەبەستی مەسەلەکەی ئێمەش :

( بە تاک دانانی الله تعالی ـیە لە خۆشویستن و دۆستایەتیدا ، واتە : دۆستایەتی بۆ دینی الله سبحانە وتعالی )

▪ چونکە ئەهلی جاهیلیەت بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ کۆبوونەوە لە دەوری یەکگرتن و پەیوەندیەکانی تر ، " وەک کۆبوونەوە لە دەوری یەکگرتنی نیشتیمانی " .

– بۆیە پێکهاتن و یەکگرتن لە دەورەی نیشتیمان دەبێت نەوەک لە دەوری دینی الله سبحانە وتعالی ، وە لێرەشدا هیچ جیاوازیەک نامێنێت لەنێوان موسڵمانێک و گاوڕێک یان یەهودیەک یان عەلمانیەک ، مەگەر بە ئەندازەی دۆستایەتی و خۆشەویستی نەبێت بۆ نیشتیمان و سەرخستنی و خزمەتکردنی هەتاوەکو ئەگەر ئەم نیشتیمانەش کافران حوکمیان تێیدا دەکرد و بەڕێوەیان دەبرد.

▪ وە تێیدا ئەم بەرنامە و یاسایانەش بەرز دەکەنەوە کە پێچەوانەی دینی ئیسلامە، وە جیهاد کردن دەبێتە لە پێناوی نیشتیمان نەوەک لە پێناوی الله تعالی ، هەتاوەکو ئەگەر گاورێک و مورتەدێک کوژرا لە پێناوی ڕژێم و بەرنامەی ئەم حاکم و فەرمان ڕەوایە ئەوا ئەوان ناوی لێ دەنێن شەهیدی نیشتیمان و شەهیدی واجب ...

--------------

وە لە داهاتووشدا بە یارمەتی الله تعالی ڕوونی دەکەینەوە کەوا جیهاد کردن درووست نییە تەنها لە پێناوی الله تعالی نەبێت هەروەکو چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوونی کردەوە ، وە بەم شێوەیەش بەڕاستی ئەوان کۆبوونەوە و پێکهاتن دەکەن لەسەر پەیوەندیەکی فیرعەونی ، وە شانازیش بە فرعەونەکانەوە دەکەن .

" سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان بتانێکن دەپەرسترێن و چەند هاوتاو هاوشێوەیەکی باطل ـن کە لە شوێنی الله دەپەرسترێن "

وە بەدڵنیاییەوە پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : « مَنْ انْتَسَبَ إِلَى تِسْعَةِ آبَاءٍ كُفَّارٍ يُرِيدُ بِهِمْ عِزًّا وَكَرَمًا ، فَهُوَ عَاشِرُهُمْ فِي النَّارِ » واتە : هەرکەسێک نەسەب و ڕەچەڵەکی خۆی بگەڕێنێتەوە بۆ نۆ پشت لە باوک و باپیرانی کە لە کافرەکانن وە بیەوێت بەهۆی ئەوانەوە عیزەت و شکۆ و ڕێز بەدەست بهێنێت ، ئەوا ئەم کەسە دەیەمیان دەبێت لەناو ئاگردا .

بۆیە ئەوان کۆبوونەوە و پێکهاتن دەکەن لەسەر پەیوەندی حیزبەکان ، کە ئەویش فیکرەیەکی هاوردە کراوە لە ئەوروپای کافرەوە ، وە مەبەستیان پێی دابەش کردن و بڵاوکردنەوەی موسڵمانانە لە پەیوەندی ئیسلامەوە ( بۆ فیکرەی کافران ) ، وە کۆبوونەوە و دەمارگیری بکەن لەسەر فیکرە و بیرۆکەکانی مرۆڤایەتی کە کورت کراوەیەکی فاسید و بۆگەنە لە پێچەوانە کردنی دینی الله تعالی .

- وە ئا بەم شێوەیە پێویستە بۆ هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت کە حەزەر بکەن و خۆیان بپارێزن لە ڕێگا و بەرنامە جۆراو جۆرەکانی جاهیلیەت ، لەبەرئەوەی ئەو ڕێگایانە زۆر جاران دەبێتە هۆی شێواندنی دینی الله سبحانه وتعالی لەژێر دروشمە ڕەونەق دارەکان و ناوە نوێکان ، وە بەم هۆیەوەش مەبەستەکانی جاهیلیەت و کوفر دێتەدی بەبێ ئەوەی کە لێی وورد ببیتەوە کە ئەمە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلامە وە بۆ مەبەستی شێواندن و لەناو بردنی ئیسلامە .

## ∮ وانــەی چل ( 40 ) ∮

جا لەبەرئەوە ولاء ـو خۆشەویستی و دۆستایەتی و سەرخستن بە تاک و تەنهایی لەسەر دینی الله ـیە ، بۆیە بێگومان هیچ ئیماندارێک نییە کە سۆز و خۆشەویستیان بۆ کافران دەربڕن لەسەر کوفرەکانیان هەتاوەکو ئەگەر ئەم کافرانە نزیکترین کەس بوون لە کەسە نزیکەکان .

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ }

واتە : کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خـودا و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خـودا و پێغەمبەری خـودا دەکەن ، هەرچەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن ، ئەوانە خـودا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە وە پشتیوانی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیەوە ، وە دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ، خـودا لێیان ڕازی بووە ئەوانیش لە خـودا ڕازی بوون ، ئەوانە حیزبوڵلان ئاگادار بن کە تەنها حیزبوڵلا ڕزگار و سەرفرازن .

[ سورەتی المجادلة : 22 ـ تەفسیری پوختە ] .

جا لێرەدا الله سبحانە وتعالی باسی کردووە کەوا هیچ ئیماندارێک نابینرێت و دەست ناکەوێت کە ئیمان دەهێنێت بە الله و بە ڕۆژی دوایی خۆشەویستی خۆی دەرببڕێت بۆ کافرێک کە دژایەتی کارە لەگەڵ الله و پێغەمبەرەکەی .

" واتە : بەڕاستی ئەم کافرە لە حەددێک ـدا یان لە بەشێک ـدا پێچەوانەکارن لەگەڵ الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) لەبەرئەمە ئەو کەسە لەسەر دینی کافرانە بۆیە الله و پێغەمبەرەکەی تورە دەکات .

وە لەدوای ئەمەشەوە مرۆڤی ئیماندار دۆستایەتی کافر ناکات لەسەر کوفرەکەی لەبەرئەوەی ئەگەر خۆشەویستی دەربڕی بۆ کافرێک لەسەر کوفرەکەی ئەوا ئەم کەسە لەدوای ئەمە ڕازیش دەبێت بە کوفرەکەی وە دانیش دەنێت بەم کوفر کردنە .

بەڵکو لەسەر مرۆڤی ئیمانداره کە ڕق و قینی هەبێت لە مرۆڤی کافر لەسەر کوفرەکەی ئەگەرچی ئەم کافرانە لەم کەسانە بوو :

- { آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ } واتە : باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن.

بۆیە ئیماندار دۆستایەتی کافر ناکات لەبەرئەوەی ئەو پەیوەندی و یەکگرتنەی کە لە دەوری کۆ دەبێتەوە بریتییە لە دینی الله سبحانە وتعالی نەوەک هیچ پەیوەندی و کۆبوونەوەیەکی تر .

▪ وە ئەگەر الله سبحانە وتعالی ڕوونی کردبێتەوە کەوا هیچ ئیماندارێک نییە کە دۆستایەتی کافرێک بکات ئەگەرچی ئەم کافرە لە نزیکترینی کەسە نزیکەکان بوو ، ئەوا لە بابی ئەولایە کە هەرکەسێک دۆستایەتی بکات لەگەڵ کافرێکی دوورتر لەمەی باسکرا ئەوا ئەم کەسە دەبێتە کافر .

وە بۆ دووپات کردنەوەی ئەم ئایەتە و ئەم واتایە ؛ ئەوا الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إَنِ اسْتَحَبُّواْ الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} واتە : ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە باوك و براکانتان دامەنێن (هەڵمەبژێرن) بە دۆست و خۆشەویست ئەگەر بێ باوەڕییان لە باوەڕ لا خۆشەویست ترو چاکتر بوو، وە هەرکەس لە ئێوە ئەوانە بکات بە دۆستی خۆی ئەوە هەر ئەوانە ستەمکارن [سورەتی التوبة : 23 ــ تەفسیری پوختە].

جا لێرەدا دەبینین کە الله تعالی نەهی و ڕێگری کردووە لە ئیمانداران لەوەی کە باوک و برایانی خۆیان بگرن بە دۆست و پشتیوان ئەگەر هاتوو ئەوان کوفریان لەلا خۆشەویستتر بوو لە ئیمان هێنان ، جا بێگومان دۆستایەتی و خۆشەویستی کەس و کار و گەل " ئەگەر ئەوانە لە کافران بوون " شـیرک ـە ، کە شیرک ـیش لەگەڵ ئیمان هێنان یەک ناگرێتەوە و إتفاق ناکەن، وە لە پێویستی ئیمان هێنان پچڕاندنی دۆستایەتی کردن لەگەڵ کافران واجب دەکات .

وە عبداللە ـی کوڕی عباس ( اللە لەخۆی و باوکی ڕازی بێت ) قسە دەکات لەسەر ئەم ئایەتەی پێشووتر باسکرا

- کە اللە تعالی دەفەرموێت : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاء إَنِ اسْتَحَبُّواْ الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ } واتە : ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە باوك و براکانتان دامەنێن ( هەڵمەبژێرن ) بە دۆست و خۆشەویست ئەگەر بێ باوەڕییان لە باوەڕ لا خۆشەویست ترو چاکتر بوو ، وە هەرکەس لە ئێوە ئەوانە بکات بە دۆستی خۆی ئەوە هەر ئەوانە ستەمکارن [ سورەتی التوبة : 23 ـ تەفسیری پوختە ]

- جا إبن عباس دەفەرموێت : ئەو کەسە موشریکە هاوشێوەی ئەوان لەبەرئەوەی هەرکەسێک ڕازی بێت بە شیرک ئەوا ئەم کەسە موشریکە .

وە ئیمامی القرطبي دەفەرموێت : وە ئەم ئایەتە حوکمەکەی دەمێنێتەوە تاکو قیامەت لە پچڕاندنی دۆستایەتی لەنێوان ئیماندااران و کافران .

وە ئەگەر ئێمە ئەمەمان بینی کە موالات و خۆشەویستی و دۆستایەتی کردنی کافرە نزیکەکان کوفرە ، ئەوا لە بابی ئەولایە کە موالات و دۆستایەتی کردنی کافرە دوورەکان هەر کوفرە .

- وە بینیمان کەوا نەهی کراوە لە موالات و دۆستایەتی کردنی کافران هەتاوەکو ئەگەر ئەم کەسانە لە نزیکترینی خەڵکی بوون ، سەیر بکە و بگەڕێوە بۆ ئەوەی کە موالات و دۆستایەتی و خۆشەویستی بوون لەسەر دینی الله ـیە بە تاک و تەنها.

نەوەک لەسەر پەیوەندی و یەکگرتنەکانی تر وەک یەکگرتن و پەیوەندی لەسەر خوێن یان نیشتیمان یان هۆز و دەمارگیری.

- بەڵام هەروەکو چۆن دەبینین کە دوژمنانی دینی الله چەندین بەدیل ـی تری نوێ دەگرنە بەر بە شێواز و وێنەی ڕازاوە و نەخشێنراو هەتاوەکو خەڵکی لە دەورەیدا کۆببێتەوە و دۆستایەتی تیایدا بکەن وە خۆشەویستیان هەبێت لەپێناویدا و بجەنگن لە پێناویدا وە دوژمنایەتیش بکەن هەر لەپێناو ئەمە .

وە ئەم کارەش تەنها عادەت و نەریتی شەیتانەکانی ئینس ـە ئەوانەی کە بەردەوام بەدیل ـەکان پێش دەخەن و کاری پێدەکەن بە لادانیان لە دینی الله سبحانە وتعالى لەژێر چەندین ناوی ڕازێنراو و نەخشێنراو.

∮ وانـەی چـل و یـەک ( 41 ) ∮

جا لەبەرئەوەی موالات و دۆستایەتی کردنی کافران لەسەر کوفرەکانیان وە سەرخستنیان لەسەر ئەم کوفرانە ئەوا ئەم کارە بە تەواوی دژە لەگەڵ دینی الله تعالی و هەڵوەشێنەرەوەیە ، لەبەرئەوەی سەرخستن و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی پێویستە کەوا بە تەنها لەسەر دینی الله تعالی بێت .

بۆیە لێرەدا بینیومانە کە الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ * فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ فَعَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُواْ عَلَى مَا أَسَرُّواْ فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ } واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەنە یارو یاوەر و پشتیوانی خۆتان ، ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن ، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت ، ئەوە هەر لەوانە و ( حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت ) بەڕاستی خـودا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات ★ بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و ( ئیمان لاوازن ) بەپەلە دەچن بۆ لایان ( بە زمانی حاڵ ) دەڵێن : دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت یان کارەساتێکمان بەسەر بێت ، جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە خـودا سەرکەوتن ببەخشێت ( بە ئیمانداران ) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەک لەلایەن خۆیەوە ( سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت ) ئەوکاتە باوەڕ

لاوازان پەشیمان دەبنەوە لەسەر ئەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیاندا شاردبوویانەوە [ سورەتی المائدة : 51 , 52 ــ تەفسیری ئاسان ].

جا لێرەدا الله سبحانه وتعالى نەهی کردووە لەوەی کە یەهودی و گاورەکان بکرێن بە دۆست و پشتیوان ، هەروەکو چۆن الله سبحانه فەرمووی :

- { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء } واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەنە یارو یاوەر و پشتیوانی خۆتان.

پاشان حەقیقەتی کارەکەیانی ڕوون کردەوە کە ئەوان دۆستایەتی یەکتر دەکەن و یەکتری سەردەخەن لەسەر کوفر وە ڕێگری و بەرهەڵستی دەکەن لە ڕێگای الله تعالى، جا الله سبحانه فەرمووی :

- { بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ } واتە : ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن.

پاشان الله تعالى هەواڵی ـدا کە هەرکەسێک دۆستایەتیان بکات و بیانکات بە پشتیوانی خۆی ئەوا ئەو کەسە کافرە وەکو ئەوان ، هەروەکو چۆن الله سبحانه فەرمووی : { وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ } واتە : ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت ، ئەوە هەر لەوانە و ( حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت ).

وە ئینجا دڵنیایی پێدان و دووپاتی کردەوە کە دەفەرموێت : { إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ }واتە : بەڕاستی خـودا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات .

پاشان الله تعالى هەواڵی ـدا کە ئەو کەسانەی کە دۆستایەتیان دەکات مونافیقەکانن ئەوانەی کە لە دڵ و دەروونیاندا گومان و دوو دڵی هەیە ، وە بەردەوام گومانیان هەیە لە سەرخستن و پشتیوانی و یارمەتی الله تعالى ( بۆ ئیماندارا ن ) ، بۆیە بەشێکیان بۆ کافرەکان دادەنا وە پەلەیان دەکرد بۆ دۆستایەتی کردنیان و هاوکاری و پشتیوانی کردنی کافران.

▪ بە بیانووی ئەوەی کە ئەوان لە هەڵگەڕانەوەی بارو دۆخەکان دەترسن وە لە سەرکەوتنی کافرەکان .

جا الله سبحانه وتعالى هەواڵی گەیاند لەبارەی حاڵی ئەو مونافیقانەوە " ئەوانەی دۆستایەتی کافران دەکەن لەسەر کوفرەکەیان " ئینجا پێیان دەفەرموێت :

- { فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ } واتە : بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و ( ئیمان لاوازن ) بەپەلە دەچن بۆ لایان ( بە زمانی حاڵ ) دەڵێن : دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت یان کارەساتێکمان بەسەر بێت.

▪ جا لەدوای ئەمەوە الله سبحانه وتعالى لەسەر ئەم گومان خراپیەی کە مونافیقان دەیبەن بۆیە دەفەرموێت :

- {فَعَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُواْ عَلَى مَا أَسَرُّواْ فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ} واتە : جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە خـودا سەرکەوتن ببەخشێت (بە ئیمانداران) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەک لەلایەن خۆیەوە

(سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت) ئەوکاتە باوەڕ لاوازان پەشیمان دەبنەوە لەسەر ئەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیاندا شاردبوویانەوە .

پاشان الله تعالی هەواڵی ـدا بە پوچەڵ بوونەوە و بە زایە چوونی کردەوەکانیان ، لەبەرئەوەی موالات و دۆستایەتی کردنی کافران کوفرە وە کردەوەکانیش پوچەڵ دەکاتەوە ، جا الله تعالی دەفەرموێت : { وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُواْ أَهَـؤُلاءِ الَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَاسِرِينَ } واتە : ئەوسا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ( لەناو خۆیاندا بە سەرسامیەوە ) دەڵێن : ئایا ئەو دووڕووانە ئەوانەن کە سوێندیان بە خـودا دەخوارد و جەختیان لەسەر دەکرد کە گوایە بەڕاستی لەگەڵتاندایین ؟! کەچی کارەکانیان پووچەڵ بوەوە و خەسارەتمەند و زەرەرمەند و مایە پووچ بوون [ سورەتی المائدة : 53 ـ تەفسیری ئاسان ].

– وە ئا بەم شێوەیە دەبینین کە موالات و دۆستایەتی کردنی یەهود و گاورەکان کوفرە بە بەڵگەی زۆرترین ئایەت .

- هەروەکو چۆن بینیمان لەم ووتەیەی الله تعالی کە فەرمووی : { وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ } واتە : ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت ، ئەوە هەر لەوانە و ( حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت ) .

وە حوذەیفە ( الله لێی ڕازی بێت ) لەسەر ئەم ئایەتەدا دەدوێت و دەفەرموێت : " ليتق أحدكم أن يكون يهوديًا أو نصرانيًا وهو لا يشعر لهذه الآية "

واتە : هەر یەکێکتان با خۆی بپارێزێت لەوەی کە ببێتە یەهودی یان گاوڕ لەکاتێکدا ئەو کەسە هەستیش بەخۆی نەکات ، لەبەر ئەم ئایەتە ... { وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ } .

وە هەمان قسە التابعي محمدی کوڕی سیرین لە عبد الله ـی کوڕی عتبة ـەوە نەقڵی کردووە .

وە پێشەوا ابن العربي المالكي ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت : " إن الآية تفيد نفي اتخاذ الأولياء من الكفار جميعًا " واتە : بەڕاستی ئەم سودەی کە لەم ئایەتە وەردەگیرێت ئەوەیە کەوا نەفی کراوە و قەدەغە کراوە لە گرتنی تەواوی کافران بە دۆست و پشتیوان .

وە پێشەوا القرطبي ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) لە تەفسیر کردنی ئەم وتەیەی الله تعالى ـدا دەفەرموێت ، کە الله تعالى دەفەرموێت : { وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ }

قال : " أي من يعاضدهم ويناصرهم على المسلمين فحكمه حكمهم في الكفر والجزاء، وهذا الحكم باقٍ إلى يوم القيامة ، وهو قطع الموالاة بين المسلمين والكافرين " واتە : الله تعالى دەفەرموێت : (ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت ، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت)).

جا پێشەوا القرطبي دەفەرموێت : واتە : هەرکەسێک هاوکاریان بکات و سەریان بخات بەسەر موسلمانانـدا ئەوا حوکمەکەی وەک حوکمی ئەوانە لە کوفر و پاداشتدا،

وە ئەم حوکمەش دەمێنێتەوە تاکو ڕۆژی قیامەت ، کە ئەویش بریتییە لە پچڕاندنی پەیوەندی لەنێوان موسلمانان و کافران.

- لەبەرئەوەی لەم ئایەتەدا مەرج هەیە وە وەڵام دانەوەش هەیە ، جا ئەگەر وەڵام دانەوەکەی بەجێ هێنا ئەوا مەرجەکەش بەجێ دەهێنێت ، واتە : هەرکەسێک دۆستایەتی و پشتیوانی کافران بکات ئەوا کافرێکە وەکو ئەوان .

جا بۆیە لەسەر مرۆڤی موسلمان واجب دەبێت کە دژایەتی کافران بکات وە نابێت دۆستایەتیان بکات ، وە واجب دەبێت لەسەری دژایەتی کردنی ئەوانەی کە دۆستایەتی دەکەن لەگەڵ کافران، وا ئاگریش واجب دەبێت بۆ کەسێک کە دۆستایەتی و پشتیوانی کافران دەکات ئەگەر تەوبەی نەکرد پێش مردنی.

- هەروەکو چۆن ئاگر واجب دەبێت بۆ کەسێک کە بە کافری مردووە وە لە ڕیزی کافرەکان بووە وە لە هاوەڵانیان بووە وە لە ئەهلی میلەت و حیزبەکەیان بووە ، وە ئەگەرچی بەخۆی نەدەگوت: من یەهودیم یان گاورم یان شیوعیم یان بەعسی ـم یان اشتراکی و سۆسیالیست ـیم یان عەلمانیم یان بت پەرستم یان هاوشێوەی ئەمانە، وە ئەگەرچی ناویشی محمد یان عەلی یان جگە لەم ناوانە بوو، وە ئەگەرچی دوو شەهادەکەی بە زمان دەردەبڕی، لەبەرئەوەی ئەو کەسە مانای ئەم دوو شەهادەیەی بەدی نەهێناوە و تەحقیقی نەکردووە، وە کاری نەکردووە بەم داوایانەی کە ئەم دوو شەهادەیە داوای لێ کردووە،

بەڵکو موالات و دۆستایەتی کردنی کافرانی هێناوە و ئامادە کردووە ، ئەو دۆستایەتیەی کە هەڵوەشێنەرەوە و دژە لەگەڵ دوو شەهادەکە و تەحقیق کردن و بەدی هێنانی تەوحید .

## ∮ وانــەی چـل و دوو ( 42 ) ∮

له وانەی ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کەوا واجبه دژایەتی کردنی کافران و نەبوونی موالات و دۆستایەتی کردن بۆیان ، وه واجبه دژایەتی کردنی ئەوانەی که دۆستایەتی دەکەن لەگەڵ کافران ، وه ئاگریش بۆ کەسێک واجب دەبێت که دۆستایەتی کافران دەکات ئەگەر له پێش مردنی ـدا تەوبەی نەکرد.

– هەروەکو چۆن ئاگر واجب دەبێت بۆ کەسێک که به کافری مردووه وه له ڕیزی کافرەکان بووه وه له هاوەڵانیان بووه وه له ئەهلی میلەت و حیزبەکەیان بووه.

وه ئەگەرچی بەخۆی نەدەگوت : من یەهودیم یان گاورم یان شیوعیم یان بەعسی ـم یان اشتراکی و سۆسیالیست ـیم یان عەلمانیم یان بت پەرستم یان هاوشێوەی ئەمانه ، وه ئەگەرچی ناویشی محمد یان عەلی یان جگه لەم ناوانه بوو ، وه ئەگەرچی دوو شەهادەکەی به زمان دەردەبڕی ، لەبەرئەوەی ئەو کەسه مانای ئەم دوو شەهادەیەی بەدی نەهێناوه و تەحقیقی نەکردووه ، وه کاری نەکردووه بەم داوایانەی که ئەم دوو شەهادەیه داوای لێ کردووه ، بەڵکو موالات و دۆستایەتی کردنی کافرانی هێناوه و ئامادە کردووه ، ئەو دۆستایەتیەی که هەڵوەشێنەرەوه و دژه لەگەڵ دوو شەهادەکه و تەحقیق کردن و بەدی هێنانی تەوحید.

وە لە ڕوویەکی ترەوە ، ئەوا الله تعالی هەواڵی داوە کەوا دۆستایەتی و پشتیوانی کافران ناکات تەنها مونافیقەکان نەبن ، هەروەکو چۆن دەفەرمویێت : { فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ } واتە : بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و ( ئیمان لاوازن ) بەپەلە دەچن بۆ لایان.

- واتە : کەسانێکن کە لە دڵەکانیاندا نەخۆشی نیفاق و دوو ڕوویی هەیە ، کە ئەم نەخۆشیەش هەبوونی گومانە لە ئەرکانەکانی ئیمان و وەعد و بەڵێنی الله سبحانە وتعالی، لە ڕووی دووەمەوە ، ئەوا الله سبحانە وتعالی هەواڵی داوە بە پوچەڵ کردنەوەی کردەوەکانی ئەو کەسانەی کە دۆستایەتی و پشتیوانی کافران دەکەن.

✓ هەروەکو چۆن الله سبحانە وتعالی لەبارەیانەوە دەفەرمویێت : {حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَاسِرِينَ} واتە : کەچی کارەکانیان پووچەڵ بوەوە و خەسارەتمەند و زەرەرمەند و مایە پووچ بوون .

وە شتێکی زانراوە کەوا کردەوەکان بە گشتی پوچەڵ نابێتەوە تەنها بەهۆی کوفر کردنەوە نەبێت .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرمویێت : {وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ} واتە : سوێند بە خـودا نیگا کراوە بۆ تۆ وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش ، ئەگەر هاوبەش بۆ خـودا دابنێی بەڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە وە بێگومان لە زەرەرمەندان دەبیت.

[سورەتی الزمر : 65 ـ تەفسیری پوختە]

جا شیرک و هاوبەش بڕیاردان ئەو کارەیە کەوا کردەوەی مرۆڤ بە گشتی هەڵدەوەشێنێتەوە .

وە هەروەکو چۆن پێشەوا قاضي عەیاض ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

" ولا يحبط العملَ إلا الكفرُ ، والكافر يُقتل " واتە : هیچ شتێک کردەوەی مرۆڤ هەڵناوەشێنێتەوە تەنها کوفر کردن نەبێت ، وە مرۆڤی کافریش دەکوژرێت .

وە پێشەوا إبن تيمية ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت : " وما قد يُفضي إلى حبوط العمل يجب تركه غاية الوجوب، والعمل يحبط بالكفر قال سبحانه : { وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ } "

وقال أيضًا : " ولا يحبط الأعمال غير الكفر " .

واتە : هەر کارێک سەرهەڵبدات و ببێتە هۆی پوچەڵ کردنەوەی کردەوەکان ئەوا واجبە واز لێ هێنانی لە ئەوپەڕی واجبیەتی دایە ، وە کردەوەش بەهۆی ئەنجامدانی کوفرەوە هەڵدەوەشێتەوە ، الله سبحانه وتعالی دەفەرموێت :

( جا هەرکەس لە ئێوە پاشگەز بێتەوە لە ئاینەکەی و بە کافریش بمرێت ، ئا ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچەڵ دەبێت ... [ سورەتی البقرة ٢١٧ ــ تەفسیری ئاسان ]

وە هەروەها دەفەرموێت : هیچ شتێک کردەوەکان پوچەڵ ناکاتەوە جگە لە کوفر کردن نەبێت .

وە ئا بەم شێوەیە بۆت ڕۆشن بوویەوە لەگەڵمان لە سێ ڕوویەوە بۆ ئەم ئایەتە کەوا موالات و دۆستایەتی کردنی کافران لەسەر کوفرەکانیان کوفرێکی دەرکەرە لە ئاینی ئیسلام .

## ∯ وانـەی چـل و سـێ ( 43 ) ∯

لەیەک بەستنێک لەوەی کە لە پێشووتر باسکرا ، ئەوا الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت: { بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا * الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ العِزَّةَ لِلّهِ جَمِيعًا }

واتە : موژدە بدە بە دوو ڕووەکان بەوەی کە بەڕاستی سزایەکی بە ئازاریان بۆ هەیە ★ ئەوانەی کە بێ باوەڕان بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان دادەنێن بێجگە لە ئیمانداران ، ئایا بەتەمان سەربەرزیان لای ئەوان دەست کەوێ ؟ ( بۆچونێکی هەڵەیە ) چونکە بەڕاستی سەربەرزی و باڵا دەستی هەمووی بۆ خـودایە .

[ سورەتی النساء : 138 , 139 ـ تەفسیری پوختە ]

الله سبحانه وتعالى لەم ئایەتەدا باسی کرد کە مونافیقەکان کافر و بێ باوەڕان بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان دادەنێن لە شوێنی ئیمانداران ، بۆیە دۆستایەتی لەگەڵ کافران دەکەن و سەریان دەخەن لەسەر کوفرەکانیان و کافرانیان خۆش دەوێت لەسەر کوفرەکانیان و مەوەدە و سۆز و بەزەیی بۆیان دەردەبڕن لەسەر ئەم کوفرە.

- وە ئەم کارەش دەکەن بە بیانووی ترسان لێیان وە بۆ بەدەستهێنانی عیزەت و سەربەرزی لەلای کافران.

- وە الله تعالی باسی کرد کەوا بۆیان ئامادە کراوە سزایەکی سەخت و بە ئازار بەهۆکاری دۆستایەتی کردنیان بۆ کافران .

وە بینەر لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە الله تعالی باسی لە تایبەتمەندترینی تایبەتمەندیەکانی مونافیقانی کردووە :

▪ کەوا مونافیقەکان کافر و بێ باوەڕان بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان دادەنێن لە شوێنی ئیمانداران ، لەکاتێکدا بەڕاستی الله سبحانە وتعالی بێجگە لەم خەسڵەت و ڕەفتارە زەمکراوە باسی شتێکی تری مونافیقەکانی نەکردووە .

- بۆیە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێک کافران بکاتە دۆست و پشتیوانی خۆی لە جێگای ئیمانداران ئەوا نیشانەیەک لە نیشانەکانی نیفاق و دوو ڕوویی گەورە دەرکەوتووە لەسەری ، ئەو نیشانە گەورەیەی کە تایبەت بوو بە مونافیقەکان لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی.

• وە هەرکەسێک نیشانەیەک لە نیشانەکانی نیفاقی گەورە دەرکەوت لەسەری ئەوا بەم کەسە دەگوترێت " موڕتەد نەوەک مونافیق "

هەروەکو چۆن حوذەیفە ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت : " إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) ، فَأَمَّا اليَوْمَ فَإِنَّمَا هُوَ الكُفْرُ بَعْدَ الإِيمَانِ "

واتە : بێگومان نیفاق و دوو ڕوویی لە سەردەمی پێغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) مونافیق و دوو ڕوویی بووە ، بەڵام نیفاقی ئەمڕۆکە بریتییە لە کوفر و بێ باوەڕی لەدوای ئیمان هێنان .

وە پێشەوا إبن تیمیة " لە هەمان ناوەڕۆک و مانا ـدا " دەفەرموێت : جێگیر بووە کەوا پێویستە ئەم ووتانە تایبەت بکرێت بەم وەصفەوە ، کە بە هەبوونی بەڵگەیەک لەسەر نیفاقەکە وەصفەکەش واجب دەبێت ، وە هەموو ئەو شتانەشی کە بەم شێوەیە بوو ئەوا کوفرە .

واتە : هەموو ئەو شتانەی کە بەڵگەیە لەسەر نیفاقی گەورە ئەوا بەلگەیە لەسەر کوفری گەورە ئەگەر دیار و ئاشکرا بوو و شاراوە نەبوو.

وە لەوانەشی کە دووپات دەبێتەوە لە موالات و دۆستایەتی کردنی کافران لە جێگای ئیمانداران وە گوێڕایەڵی کردنیان لە هەموو ئەم شتانەی کە کافران فەرمانیان پێ دەکەن جا جیاوای نییە کوفر بێت یان بەرهەڵستی کردن بێت لە ڕێگای الله تعالى یان هاوشێوەی ئەمانە ئەوا کوفری أکبر و گەورەیە.

کە لەم ووتەیەی الله تعالى لەبارەی هەندێک لە جۆری موڕتەدەکان دەفەرمووێت: {إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ * فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ}

واتە : بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە ( لە ئایینەکەیان ) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە ، شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بە هیواو ئومێد فریوی دابوون ★ چونکە ئەوان دەیان وت بەو کەسانەی کە ڕقیان بوو لەو قورئانەی خـودا ناردبووی ، ئێمە لەمەولا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین ، وە خـودا بە نهێنیەکانیان دەزانێ ★ ئاخۆ چۆن بێ ( حاڵی ئەو ناپاکانە ) کاتێ فریشتەکان گیانیان دەکێشن و لە ڕوخسارو پاشیان دەدەن ★ ئەو ( جۆرە گیان کێشانە ) لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شوێن شتانێ کەوتبوون کە خـودای توڕە کردبوو ڕەزامەندی خـوداشیان پێ ناخۆش بوو بۆیە خـوداش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە [ سورەتی محمد : 25 ... 28 ـ تەفسیری پوختە ].

- جا لێرەدا الله تعالی باسی صنف و چینێک لە موڕتەدەکانی کرد ، کە فەرمووی : {إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى} واتە : بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە ( لە ئایینەکەیان ) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە.

واتە : دەرئەنجامی ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیان لە دین لەبەر جەهل و نەزانین نەبوو ، بەڵکو لە دوای عیلم و ڕوون بوونەوەی هیدایەت و حەق بـوو بۆیان .

- جا ئەم کەسانە { الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ } واتە : شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بە هیواو ئومێد فریوی دابوون.

▪ وە هۆکاری ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیان ئەوە بوو کەوا ئەوان بەم کافرانەیان دەگووت ئەوانەی ڕقیان لەو پەیامە دەبوویەوە کە الله دایبەزاندووە :

دەیانگووت : لە داهاتوودا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین ،

- هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : { ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ } واتە : چونکە ئەوان دەیان وت بەو کەسانەی کە ڕقیان بوو لەو قورئانەی خـودا ناردبووی ، ئێمە لەمەولا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین.

- وە وا گومانیان دەبرد کەوا خەڵکی هیچ شتێک لەبارەیان نازانن {وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ}

واتە : وە خـودا بە نهێنیەکانیان دەزانێ.

- پاشان الله تعالی هەواڵی ـدا لەبارەی حاڵ و بارو دۆخیان لە حاڵی سەرەمەرگ و مردندا کە دەفەرموێت : { فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ } واتە : ئاخۆ چۆن بێ ( حاڵی ئەو ناپاکانە ) کاتێ فریشتەکان گیانیان دەکێشن و لە ڕوخسارو پاشیان دەدەن ★ ئەو ( جۆرە گیان کێشانە ) لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شوێن شتانێ کەوتبوون کە خـودای توڕە کردبوو ڕەزامەندی خـوداشیان پێ ناخۆش بوو بۆیە خـوداش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە.

وە لەم ئایەتانەدا ئەمانەی خوارەوەمان بۆ ڕوون بوویەوە :-

① لێرەدا موڕتەدانێک هەنە لە دینی ئیسلام ، بەم شێوەیە نییە هەروەکو چۆن جاهیلەکان وا گومان دەبەن کەوا درووست نییە تەکفیر کردنی هیچ کەسێک .

② هۆکاری ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیان بریتی نەبوو لە جەهل ، بۆیە هیچ مانع و ڕێگرێک نییە لە ڕیددە و هەڵگەڕانەوەی کەسی عالم و تێگەیشتوو لە حەق ، بەهۆی نەتیجە و ئەنجامی هەواو ئارەزوو یان شەهوەت یان لەبەر چەند بەرژەوەندیەکی دونیایی .

③ هۆکاری ڕیددە و هەڵگەڕانەوەکەیان بریتی بوو لەم قسەیەیان و لەم پەیمانەیان کە ئەیاندا بە کافرەکان ئەوانەی کە ڕقیان دەبوویەوە لەم پەیامەی کە الله تعالی دایبەزاندووە :

- { سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ } واتە : ئێمە لەمەولا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین.

- جا لە بابی ئەولایە کە هەرکەسێک وەعد و پەیمان بە کافران بدات لەسەر گوێڕایەڵی کردنیان لە هەموو کارێکدا نەوەک لە هەندێکی ئەوا ئەو کەسە موڕتەدە ، وە لە بابی ئەولایە کەوا هەرکەسێک گوێڕایەڵیان بکات بە شێوازی کرداری نەوەک بە تەنها لەسەر بەڵێن ـدانەکە ئەوا ئەو کەسە هەر موڕتەدە .

④ وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا گوێڕایەڵی کردن بۆ کافران ئەوا ئەم کارە دەرکەرە لە میلەتی ئیسلام .

" وە لە داهاتووشدا باسی کۆمەڵێک لە جۆرەکانی ئەم گوێڕایەڵیانە دەکەین کە مرۆڤ کافر دەکات " : وەک گوێڕایەڵی کردنیان لە بەرهەڵستی کردن لە ڕێگای الله ـدا وە ئازاردانی ئیماندارا‌ن و هاوشێوەی ئەمانە .

⑤ لە تایبەتمەندیەکانی کافران ئەوەیە کەوا ئەوان ڕقیان لەم قورئانە دەبێتەوە کە الله دایبەزاندووە لە شەرع و قورئان هەروەکو چۆن الله تعالى وەصفیان دەکات بە یەک وەصف لەم ئایەتەدا ، کە دەفەرموێت : { ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ } واتە : چونکە ئەوان دەیان وت بەو کەسانەی کە ڕقیان بوو لەو قورئانەی خـودا ناردبووی ، ئێمە لەمەولا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین.

- بۆیە بە تەواوی تەعبیر و لێکدانەوە دەدات لەبارەی کافرانەوە بەوەی کەوا ئەوان ڕقیان دەبوویەوە لەم قورئانەی کە الله دایبەزاندووە : { كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ } واتە : ڕقیان بوو لەو قورئانەی خـودا ناردبووی.

جا هەرکەسێک ڕقی لەم قورئانە ببێتەوە کە الله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسە کافرە ، ئەگەرچی بانگەشەی ئیسلامەتیش بکات.

وەکو ئەو کەسانەی کە حوکم و دادوەری بە غەیری شەرعی ئیسلام دەکەن ، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە عەلمانیەت بە چاکتر دادەنێن بەسەر ئیسلام ـدا ، وە دیموکراسی و هاوشێوەی ئەوانە بە چاکتر دادەنێن بەسەر ئیسلام ـدا .

∮ وانـەی چـل و چـوار ( 44 ) ∮

لەسەر ئەم ووتەیەی الله تعالی دووپات دەکەینەوە کە دەفەرمویّت : { إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ * فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ }

واتە : بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە ( لە ئایینەکەیان ) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە ، شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بە هیواو ئومێد فریوی دابوون ★ چونکە ئەوان دەیان وت بەو کەسانەی کە ڕقیان بوو لەو قورئانەی خـودا ناردبووی ، ئێمە لەمەولا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین ، وە خـودا بە نهێنیەکانیان دەزانێ ★ ئاخۆ چۆن بێ ( حاڵی ئەو ناپاکانە ) کاتێ فریشتەکان گیانیان دەکێشن و لە ڕوخسارو پاشیان دەدەن ★ ئەو ( جۆرە گیان کێشانە ) لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شوێن شتانێ کەوتبوون کە خـودای توڕە کردبوو ڕەزامەندی خـوداشیان پێ ناخۆش بوو بۆیە خـوداش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە [ سورەتی محمد : 25 ... 28 ــ تەفسیری پوختە ].

ئەو سوودەی کە لێی وەردەگیرێت ئەوەیە کە : لە جۆرەکانی ئەو موالات و دۆستایەتی کردنەی کە مرۆڤ کافر دەکات :

⛔ " وەعد و پەیمان دانە بە کافران لەسەر گوێڕایەڵی کردنیان "

✳ (( وە ئەگەر ڕیددە و هەڵگەڕاوە حاصل و دەرئەنجام و دەستکەوت بوو بۆ کەسێک کە پەیمان ئەدات بە موشریکان لەسەر گوێڕایەڵی کردنیان ، ئەی حاڵی ئەو کەسانە چۆنە کە موافق و پەسەندی موشریکان دەکات و گوێڕایەڵیان دەکات لە هەموو کارو بارێکدا بە ووتە و کردەوە !!

▪ ئایا ئەم جۆرە کەسانە لە پێشتر نینە بە ڕیددە و هەڵگەڕانەوە لە دین لەو کەسانەی کە پەیمان ئەدەن بە موشریکان لەسەر گوێڕایەڵی کردن لە هەندێک کارو بار ـدا بەبێ هەندێکی تر !!

▪ بەگوێرەی ئەمە بێگومان شوێنکەوتنی موشریکان و چوون بەدەم گوێڕایەڵی کردنیان ، وە شاهێدی دان بۆیان بەوەی کە ئەوان لەسەر حەق ـن ، وە کۆمەکی و هاوکاری کردنیان لەسەر ناحەق و باطل ، وە تەرک کردن و وازهێنان لە تەوحید و ئەهلەکەی وە پشت بەردان و یارمەتی نەدانی هاوڕێکانی ، هەموو ئەم کارانە هۆکارن بۆ تووش بوون بە ڕیددە و کوفر ))

✔ وە بۆت ڕوون بوویەوە لەگەڵمان لەمەوە کە موالات و دۆستایەتی کردنی کافران مرۆڤ کافر دەکات بۆ ئەو کەسەی کە بکەوێتە ناویەوە ، بە بەڵگەی ئەم ووتەیەی الله تعالی لەم ئایەتانەدا کە دەفەرموێت :

- { إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى } واته : بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە ( لە ئایینەکەیان ) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە.

وە ڕیددە و هەڵگەڕانەوە : بریتییە لە پاشەکشە کردن و رجوع بوونەوە لە ئاینی ئیسلام بۆ ناو کوفر .

– لەگەڵ ئەمەشدا لەم ووتەیەی الله تعالی کە لەبارەی ئەو موڕتەدانەوە دەفەرموێت : { ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ } واته : ئەو ( جۆرە گیان کێشانە ) لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شوێن شتانێ کەوتبوون کە خـودای توڕە کردبوو ڕەزامەندی خـوداشیان پێ ناخۆش بوو بۆیە خـوداش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە.

وە هەروەکو چۆن لە پێشووتردا باسکرا کەوا ( هەڵوەشانەوە و پوچەڵ بوونەوەی کردەوەکان بە گشتی ) ڕوو نادات مەگەر لەگەڵ کوفر کردندا نەبێت ، وە لە قورئان ـیشدا باس لە پوچەڵ بوونەوەی کردەوەکان نەکراوە تەنها لەکاتی باسی کوفر کردن ـدا نەبێت .

∮ وانـەی چـل و پێـنج ( 45 ) ∮

وه ئا بەم شێوەیە لەگەڵمان بۆت ڕوون بوویەوە ئەوەی کە لە پێشووتر باسکرا لەم ئایەتانەی خوارەوە :-

① کە الله تعالی موالات و دۆستایەتی کردنی گەمارۆ داوە و تەرخانی کردووە تەنها بۆ خۆی سبحانه وتعالی وه بۆ پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) وه بۆ ئیماندارن:

{إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ} واتە : بێگومان دۆست و یارمەتی دەری ئێوە تەنها خـودا و پێغەمبەرەکەیی و بڕوادارانن ، ئەوانەی کە بە ڕێکو پێکی نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنن و زەکات ئەدەن بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خـودا [ سورەتی المائدة : 55 ــ تەفسیری پوختە ] .

② درووست نییە دۆستایەتی و پشتیوانی کردنی کافران سەرەڕای جیاوازی جۆرەکانیان ، جیاوازی نییە کە یەهودی بوون یان گاور یان بت پەرست یان مورتەد بوون یان پێچەوانەی ئەمانە.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : {لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ} واتە : نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران.

وە هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ} واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکە و گاوور مەکەن بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ، ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن ، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە.

وە هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} واتە : ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە دامەنێن ئەوانەی کە ئایینەکەی ئێوە دادەنێن ( بە شتێکی ) گاڵتە و لاقرتی پێکراو لەوانەی نامەیان پێ بەخشراوە لەپێش ئێوەدا وە لە بێ بڕواکانیش ( دایان مەنێن ) بە دۆست و خۆشەویست ، وە لە خـودا بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن [ سورەتی المائدة : 57 ــ تەفسیری پوختە ].

جا الله سبحانە وتعالى نەهی کردووە و قەدەغەی کردووە لە گرتنی کافران بە دۆست و پشتیوان ، جا جیاوازی نییە ئەوانە بن کە کتێب ـیان پێ بەخشراوە ( واتە : یەهود و گاور ) یان هەموو کافران بە شێوەیەکی گشتی.

③ کافران دوژمنی ئیماندارانن ، بۆیە درووست نییە دۆستایەتی کردنیان هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ} واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان [ سورەتی الممتحنة : 1 ــ تەفسیری پوختە ] .

④ پیاو و ئافرەتی ئیماندار مەوەددە و خۆشەویستی خۆی بۆ هیچ کافرێک دەرنابڕێت لەسەر کوفرەکەی ، ئەگەرچی ئەو کافرە لە کەسە هەرە نزیکەکانی بوو.

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : {لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ..}

واتە : کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خـودا و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خـودا و پێغەمبەری خـودا دەکەن ، هەرچەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن.

وە هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاء إَنِ اسْتَحَبُّواْ الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} واتە : ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە باوك و براکانتان دامەنێن ( هەڵمەبژێرن ) بە دۆست و خۆشەویست ئەگەر بێ باوەڕییان لە باوەڕ لا خۆشەویست ترو چاکتر بوو ، وە هەرکەس لە ئێوە ئەوانە بکات بە دۆستی خۆی ئەوە هەر ئەوانە ستەمکارن.

- وە ( ئەگەر بۆ باوک و برا درووست نەبێت ) ئەوا لە بابی ئەولایە کەوا بێگومان دۆستایەتی و خۆشەویستی کافرە دوورترەکان هەر درووست نییە .

⑤ واجبە خۆ بەری کردن و دوورە پەرێزی لە : موشریکان لە تاک تاکیان ، وە لەم هاوتا و پەرستراوە باطل ـانەی کە لە جێگای الله تعالی دەپەرسترێت .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إبراهيم وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُراء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ .. } واتە : بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ، کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خـودا.

⑥ دەرخستنی دوژمنایەتی و ڕق و قین لە کافران لە پێویستیەکانی خۆ بەری کردن و بەڕائەتە لە کافران.

هەروەکو چۆن لە هەمان ئایەتدا هاتووە لەسەر زمانی إبراهیم (سەلامی الله لێی بێت) وە هەموو ئەوانەشی شوێنی کەوتبوون لە پێغەمبەران (سەلامی الله لە هەموویان بێت) وە هەموو ئیماندارارن لەم ووتەیەیاندا کە بە کافرانیان گووت : { كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ } واتە : ئێمە باوەڕمان نییە بە (ئایینی) ئێوە وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە ، تا کاتێك کە بڕوا بە خـودای تەنیا دەهێنن.

⑦ دۆستایەتی و پشتیوانی کردنی کافران لەسەر دینە باطل و پووچەکانیان ، یان سەرخستنیان دژی موسلمانان ، یان خۆشویستنیان لەسەر کوفرەکانیان ، یان گوێڕایەڵی کردنیان لەو شتەی کە کوفرە ، هەموو ئەمانە کوفرن ؛

لەبەرئەوەی لە دۆستایەتی و پشتیوانی کردنی کافران مرۆڤ کافر دەکات و دەریدەکات لە میلەتی ئیسلام ، هەروەکو چۆن لە پێشووتردا ژمارەیەک لە ئایەتەکان باسکرا وە هەروەها باسی لێدوانی زانایانیش کرا لەسەری .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ } واتە : نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران ، وە هەرکەسێک وابکات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خـودادا نامێنێ.

واتە : بێگومان بەری بووە لە الله تعالی وە الله تعالی ـش لەو بەری بووە بەهۆی مورتەد بوون و هەڵگەڕانەوەی لە دین و چوونی بۆ ناو کوفر.

هەروەکو چۆن إبن جریر الطبري ( رەحمەتی الله لێی بێت ) فەرموویەتی:

لەم ووتەیەی الله تعالی کە دەفەرموێت : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ } واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکە و گاوور مەکەن بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ، ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن ، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە.

جا هەرکەسێک دۆستایەتی یەهودیەکان بکات ئەوا ئەو کەسە یەهودیە ، وە هەرکەسێک دۆستایەتی گاورەکان بکات ئەوا ئەو کەسە گاورە ، وە هەرکەسێک دۆستایەتی کافران بکات ئەوا ئەو کەسە کافرە هاوشێوەی ئەوان.

هەروەکو چۆن ئەوەی پێشوو باسکرا لە حوذەیفە ( الله لێی ڕازی بێت ) وە عبد الله بن عتبة و القرطبي و جگە لەوانیش.

وە هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { تَرَى كَثِيراً مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ * وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَـكِنَّ كَثِيراً مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ }

واتە : ئەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) زۆربەیان دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بێگومان زۆر بەد و خراپە ئەوەی کە پێشیان خست بۆ خۆیان ( کردویانە ) کە هۆی خەشم و قینی خـودا بوو لێیان وە ئەوانە لە سزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە ★ وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خـودا و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ، ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خـودا .

جا هەرکەسێک دۆستایەتی کافران بکات ئەوا ڕێکخراوە بەسەریدا :

- { أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ } واتە : کە هۆی خەشم و قینی خـودا بوو لێیان وە ئەوانە لە سزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە.

- " جا موالات و دۆستایەتی کردنی کافران ڕێک دەخرێت بەسەر ئەوکەسەدا کە تورەبوونی الله تعالی و مانەوەی هەمیشەیی لە سزا و ئەشکەنجەدا ، لەبەرئەوەی دۆستایەتی کردنی کافران لەسەر کوفرەکانیان کوفری دەرکەرە لە میلەتی ئیسلام " .

∯ وانــەی چــل و شــەش ( 46 ) ∯

⑧ وە بۆیە بێگومان دۆستایەتی کافران ناکات مەگەر ئەو کەسانە نەبن کە لە دڵیاندا نیفاق و دوو ڕوویی گەورە هەیە ئەو نیفاقەی کە دەرکەرە لە ئاینی ئیسلام.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : {بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا * الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ..} واتە : موژدە بدە بە دوو ڕووەکان بەوەی کە بەڕاستی سزایەکی بە ئازاریان بۆ هەیە ★ ئەوانەی کە بێ باوەڕان بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان دادەنێن بێجگە لە ئیماندااران.

جا دانانی کافران بە دۆست و خۆشەویست لە جێگای ئیمانداران لە تایبەتمەندترینی تایبەتمەندیەکانی مونافیقانە.

وە هەروەکو چۆن الله تعالی لەبارەی دۆستایەتی کردنی یەهود و گاورەکان دەفەرموێت : {فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ} واتە : بۆیە ئەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشی ( دوو ڕوویی ) تیایە پێشبڕکێ ئەکەن لە دۆستایەتی ئەو ( جوولەکە و گاوور ) انەدا ئەڵێن ئەترسین کە بەسەرهاتی ناخۆشی ڕۆژگار دوچارمان ببێت.

⑨ شەهادە هێنان بە : " لا إله إلا الله وأن محمدًا رسول الله " پێویستی بە نەبوونی موالات و دۆستایەتی کردنی کافران دەبێت .

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَـكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ } واتە : وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خـودا و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ، ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر ، بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خـودا .

جا ئیمان هێنان بە الله و بە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و بەم پەیامەی کە نێردراوەتە خوارە بۆ سەری ( ئەو ئیمان هێنانە ) پێویستی دەبێت بە نەگرتنی کافران بە دۆست و پشتیوان .

وە ئا بەم شێوەیە دەبینیت کەوا پەیوەندیەکی پتەو و قایم هەیە لە نێوان تەحقیق کردن و بەدی هێنانی تەوحید و نەبوونی دۆستایەتی بۆ کافران .

⑩ لە ماناکای موالات و دۆستایەتی :

( سەرخستن و خۆشویستن و سۆزو بەزەیی دەربڕین و گوێڕایەڵی کردن و کۆمەکی و هاوکاری کردن و ڕازی بوون بەم کارو قسانەیان کە مرۆڤ کافر دەکات ، وە کردنیان بە دۆستی گیانی بە گیانی ، وە هاوشێوەی ئەمانە )

لەکاتێکدا دۆستایەتی کردن لە الولاء ـەوە وەرگیراوە ، کە ئەویش بریتییە لە دۆستایەتی و نزیک بوونەوە و شوێن کەوتن، وە دۆستایەتی دژی دوژمنایەتیە ، وە پشتگیری کردن و یاریدەدەری پێچەوانەی دوژمنە.

- جا ئیماندارن أولیاء الرحمن ـن لەبەر نزیکیان لە الله تعالی بەهۆی گوێڕایەڵی کردنی و بەندایەتی بۆ کردنی و ئیمان هێنان پێی.

– وە کافرەکان أولیاء الشیطان ـن لەبەر نزیکیان لە شەیتان بەهۆی گوێڕایەڵی کردنی و شوێنکەوتنی ، وە لەبەر دووریان لە الله بەهۆی سەرپێچی کردنی و پێچەوانە کردنی الله تعالی.

جا ئەگەر ئەمەمان زانی ئەوا بێگومان ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان دۆستایەتی ئیمانداران دەکەن لەسەر دینی الله سبحانە وتعالی ، وە دوژمنایەتی کافران دەکەن لەپێناوی الله سبحانە وتعالی .

وە ئەمەش هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ } واتە : پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان یارمەتی دەرو خۆشەویستی هەندێکی تریانن [ سورەتی التوبة : 71 ـ تەفسیری پوختە ].

وە هەروەکو چۆن پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیە وسلم ) لە وەصفی ئیمانداراندا دەفەرموێت : « تَرَى الْمُؤْمِنِينَ فِي تَرَاحُمِهِمْ وَتَوَادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ ، كَمَثَلِ الجَسَدِ ، إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالحُمَّى »

واتە : ئیماندااران دەبینیت لە بە بەزەیی بوون و خۆشەویستی و میهرەبانی نواندنیان بۆ یەکتر ، وەکو نموونەی لاشەیەک وایە ، ئەگەر ئەندامێکی ئێش و ئازاری هەبێت ئەوا هەموو ئەو لاشەیە لە پێناویدا بێ خەو دەبێت و تـــــا دەیگرێت .

- وە لە بەرامبەردا بەڕاستی ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان دەربڕینی سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی و سەرخستن و گوێڕایەڵی کردن هەموو ئەمانە دەپچڕێنن لەگەڵ کافران ، بەڵکو هەموو ئەم کارانەش بەرامبەر بە کافران ئاشکرا دەکەن و دەریدەخەن " کاتێک کە توانایان هەبوو بەسەر ئەم کارەدا "

هەروەکو چۆن لە پێشوودا ووتەکەی الله تعالی باسکرا کە دەفەرموێت : {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إبراهيم وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ...}

واتە : بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ، کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت : بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خـودا ، ئێمە باوەڕمان نییە بە ( ئایینی ) ئێوە ، وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە خـودای تەنیا دەهێنن.

-----------------------------------

- جا ئەگەر ئەمە ڕوویدا ئەوا بەڕاستی پێویستە هەموو پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار موسلمانان سەربخەن لەسەر دینی الله تعالی ، تەنها ئەگەر تووشی زوڵم و ستەم بوون ئەوا سەریان ناخەن بەڵکو وازیان لێ دێنن ئەوەنەی دەستەڵاتی بەسەردا دەشکێت ، وە ئیماندارانی خۆش بوویت لەسەر ئەندازەی ئیمانەکەیان و گوێڕایەڵیەکەیان وە هاوکاری و کۆمەکی ئیمانداران بکات ئەوەنەی توانای هەیە .

وە ئا بەم شێوەیە بە شێوازێکی زۆرەوە باس لە هەندێکی دەکەین بە یارمەتی الله تعالی ، وە هەمووشی تەعبیر و لێکدانەوە دەکات لە کۆبوونەوە و چوونە پاڵ یەکی ئیمانداران ، کە ئەویش لە دەورەی پەیوەندی دینەوەیە بە تاک و تەنها .

وە لە بەرامبەریشدا بەڕاستی لەسەر ئیماندارانە کەوا ڕق و قینی لە مرۆڤی کافر ببێتەوە لەبەر کوفرەکەی ، وە سەرخەری نەبێت ، وە هاوکاری و کۆمەکی نەکات لەسەر کوفرەکەی ، وە پشتگیر و یارمەتیدەری نەبێت لە دژی موسلمانان ، وە نابێت کافران بکرێنە تایبەتمەند و بژاردە و دۆستی گیانی بە گیانی و پشتیوان ، وە دەبێت دژایەتی کافران بکرێت لەبەر کوفرەکانیان.

وە جگە لەمانەش لە شێوازی تر ، ئەوەی کە ڕوون بوویەوە لە خۆ بەری کردن و بەرائەتەکەی لە کافران و دەربڕینی دوژمنایەتی بۆیان لەسەر دینی الله تعالی تاوەکو ئیمان بە تاک و تەنهایی الله تعالی دەهێنن .

∮ وانـەی چـل و حـەوت ( 47 ) ∮

11 ـ دەبینین کەوا ( بەهێزترینی دەست گری ئیمان ، خۆشەویستیە لە پێناوی الله ، وە ڕق لێ بوونەوەیە لە پێناوی الله )

ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خـودا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : « أَوْثَقُ عُرَى الْإِيمَانِ الموالاة في الله ، والمعادة في الله ، والْحُبُّ فِي اللَّهِ وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ ».

واتە : بەهێزترین دەست گری ئیمان پشتیوانی و دۆستایەتییە لە پێناوی الله ، وە دژایەتیە لە پێناوی الله ، وە خۆشەویستیە لە پێناوی الله وە ڕق لێ بوونەوەیە لە پێناوی الله .

العُروة : بریتییە لە دەسکی قاپ و دەفر ، واتە : ئەو ڕوویەی ئەگەر بتەوێت قاپ و دەفری بەهۆیەوە پێی بگری لەبەر گرتنی ئەم ڕوویە قایمە لە دەستت ناکەوێتە خوارەوە.

وە مانای : خۆشەویستی لە پێناوی الله ، وە ڕق لێ بوونەوە لە پێناوی الله ، بریتییە لە بەهێزترینی ڕوو کە بەندە بەهۆیەوە بتوانێت دەستگر بێت بە دینەوە .

- بۆیە دین لە خاوەنەکەی ناپچڕێت و جیا نابێتەوە مادام دەستی گرتووە بەم ڕووەوە .

- وە هەمان حاڵیش بە نسبەت بۆ دۆستایەتی و دژایەتی کردن لە پێناوی الله ، ئەوا هەردووکیان لە پتەوترین و بەهێزترینی دەستگری ئیمانە .

کەواتە مانای خۆشەویستی لە پێناوی الله و ڕق لێ بوونەوە لە پێناوی چییە ؟

- خۆشەویستی لە پێناوی الله :-

بریتییە لە خۆشەویستی لەبەر ئیمان و گوێڕایەڵی .

- ڕق لێ بوونەوە لە پێناوی الله :-

بریتییە لە ڕق لێ بوونەوە لەبەر کوفر و سەرپێچی .

وە لێرەدا بەڕاستی ئەهلی سوننە خەڵکی دابەش دەکەن بۆ سێ بەش لە ڕووی خۆشویستن و ڕق لێ بوونەوە :

أ ) لێرەدا کەسانێکیان خۆش دەوێت بە شێوەیەکی گشتی ، کە ئەویش بریتییە لە مرۆڤێکی ئیمانداری گوێڕایەڵ ، ئەو کەسەی کەوا ئیمانی لێ دەرکەوتووە ، وە لێی دەرنەکەوتووە ئەو شتەی کە لە شەرعدا ئینکاری کردنی لێی واجب بکات .

ب ) وە لێرەدا کەسانێکیان ڕق لێ دەبێتەوە بە شێوەیەکی گشتی ، کە ئەویش بریتییە لە مرۆڤێکی کافر وە موڕتەدیش دەگرێتەوە ، چونکە موڕتەد کافریەتەکەی زۆر بەهێزترە لە کافری ئەصلی .

ج ) وە لێرەدا کەسانێکیان خۆش دەوێت لە ڕوویەکەوە، وە کەسانێکیشیان ڕق لێ دەبێتەوە لە ڕوویەکەوە، کە ئەویش بریتییە لە موسلمانێکی سەرپێچی کار، وە موسلمانێکی فاسق و لە سنوور دەرچوو، وە موسلمانێکی بیدعە چی، ئەو بیدعەیەی کە مرۆڤ کافر ناکات، جا ئەم جۆرەیان ئەم کەسەیان خۆش دەوێت لەبەر

ئیسلامەتیەکەی وە بە ئەندازەی گوێڕایەڵیەکەی ، وە ڕقیان لێ دەبێتەوە بە ئەندازەی تاوان و سەرپێچیەکەی جا جیاوازی نییە بچووک بێت یان گەورە بێت ، وە ڕقیان لێی دەبێتەوە بە ئەندازەی خراپی و فەسادیەکەی لە دیندا .

..........................................................................

12 ـ بۆچی موالات و دۆستایەتی کردن لە پێناوی الله ، وە دژایەتی کردن لە پێناوی الله ، وە خۆشەویستی لە پێناوی الله ، وە ڕق لێ بوونەوە لە پێناوی الله ، پتەوترینی دەستگری ئیمانە ؟ وە ئەو پلەو پایە گەورەیەی هەیە لە دیندا ؟

وەڵام : لەبەرئەوەی خۆشەویستی لە پێناو الله ، وە ڕق لێ بوونەوە لە پێناو الله ، وە موالات و دۆستایەتی لە پێناو الله ، وە دژایەتی کردن لە پێناو الله، سەر هەڵنادات تەنها لە کەسێکدا نەبێت کە دڵەکەی پڕیەتی لە ئیمان ، وە ئامانج و مەبەستیشی ڕەزامەندی الله سبحانە وتعالى ـیە ، وە خۆشەویستیەکەی لەبەر الله زۆر زیاترە لە خۆشەویستیەکەی لەبەر خۆی ، بۆیە مەبەستەکەی لەبەر الله سبحانە وتعالى ـیە نەوەک لەبەر هەواو ئارەزووی خۆی یان لەبەر ڕازی کردنی خەڵکی لە خۆی.

بەڵکو مرۆڤی ئیماندار خۆشەویستی و ڕقی نییە لە پێناو الله تەنها کاتێک کەوا خاوەنی ئیمانی صحیح و ڕاست و درووست بوو ، وە لە دوای ئەمەشەوە خۆشەویستی لە پێناو الله وە ڕقیش لە پێناو الله ( بە پێوەری پلەی ئیمانە ) .

" له ڕوویه‌كی تره‌وه " به‌ڕاستی ڕق لێ بوونه‌وه و دژایه‌تی له پێناو الله ته‌عبیر ده‌كات له بواری په‌رۆشی و خه‌مخۆری له‌سه‌ر پیرۆزیه‌كانی الله سبحانه وتعالی.

جا هه‌ركه‌سێک له دڵیدا په‌رۆشی و خه‌مخۆری هه‌یه له پێناو الله سبحانه وتعالی ئه‌وا پێویسته كه‌وا ڕق و قینی هه‌بێت له پێناو الله ، وه دژایه‌تی هه‌بێت له پێناو الله.

- جا هه‌ركه‌سێک ڕق لێ بوونه‌وه‌ی نه‌بێت له پێناو الله وه دژایه‌تی كردنی نه‌بێت له پێناو الله ئه‌وا به په‌رۆش و خه‌مخۆر نییه له‌سه‌ر دینی الله و پیرۆزیه‌كانی ، وه ئه‌مه‌ش ڕوو نادات ته‌نها له كه‌سانی كافر و مونافق نه‌بێت.

بۆیه له فه‌رمووده‌دا هاتووه له واثلة ابن الأسقع ( الله لێی ڕازی بێت ) له پێغه‌مبه‌ری خـوداوه ( صلى الله عليه وسلم ) ده‌فه‌رموێت :

« وَيُؤْتَى بِعَبْدٍ مُحْسِنٍ فِي نَفْسِهِ لَا يُرَى أَنَّ لَهُ ذَنْبًا ، فَيَقُولُ لَهُ : هَلْ كُنْتَ تَوَالِي أَوْلِيَائِي ؟ قَالَ : كُنْتُ لِلنَّاسِ سَلْمًا . قَالَ : فَهَلْ كُنْتَ تُعَادِي أَعْدَائِي ؟ قَالَ : يَا رَبِّ ، لَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَ أَحَدٍ شَيْئًا ، فَيَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ : لَا يَنَالُ رَحْمَتِي مَنْ لَا يُوَالِي أَوْلِيَائِي ويُعَادِي أَعْدَائِي » . [ رواه الطبراني في (المعجم الكبير) ، وأبو نعيم في (الحلية) ، وأورده الشيخ حمود التويجري في (تحفة الإخوان) ]

واته : ( له لێ پرسینه‌وه‌ی الله تعالى له ڕۆژی قیامه‌تدا ) به‌نده‌یه‌كی چاكه‌كار ده‌هێنرێت له نه‌فسی خۆیدا كه هیچ تاوانێكی لێ نابینرێت ، ئینجا پێی ده‌ڵێت : ئایا دۆستایه‌تی أولیاء و دۆسته‌كانی منت كردبوو ، ده‌ڵێت : من بۆ خه‌ڵكی سه‌لامه‌ت و بێ كێشه بووم ، ده‌فه‌رموێت : ئه‌ی ئایا دوژمنایه‌تی دوژمنه‌كانی منت كردبوو ؟ ده‌ڵێت :

ئەی پەروەردگارە ، لە نێوان من و لە نێوان هیچ کەسێک هیچ شتێک نەبووە ، ئینجا الله عز وجل دەفەرموێت : رەحمەتی من بە دەست ناهێنێت ئەو کەسەی کە دۆستایەتی دۆستەکانم نەکات وە دوژمنایەتی دوژمنەکانم نەکات .

∮ وانـەی چـل و هـەشـت ( 48 ) ∮

وە هەروەها بە دڵنیاییەوە دۆستایەتی کردن لە پێناو الله ، وە دژایەتی کردن لە پێناو الله ئەو پەیوەندیە قاییم و بەهێزەیە کە نێوانی موسلمانان کۆدەکاتەوە.

چونکە موسلمانان هەندێکیان دۆستایەتی و پشتیوانی هەندێکی تریان دەکەن لەسەر دینی الله سبحانە وتعالی ، جگە لەمە لەسەر هیچ پەیوەندیەکی تر نییە.

وە لێرەدا موسلمانان یەکتریان خۆش دەوێت و یەکتری سەردەخەن و کۆمەکی و هاوکاری یەکتری دەکەن لەسەر دینی الله سبحانە وتعالی .

وە لە بەرامبەردا ڕق و قینیان لە کافران دەبێتەوە و لە دژیان دەوەستنەوە و جەنگیان لەگەڵ دەکەن لەبەر کوفرەکانیان و ڕێگری کردنیان لە ڕێگای الله تعالی.

بۆیە بێگومان کەی موسلمانان لەم مانایە تێگەیشتن ئەوا دادەمەزرێنێت بەسەر خۆیدا نەهێشتنی خۆشەویستی و سەرخستن لە پێناو دەمارگیریەکانی تر :

⛔ " وەک : سەرخستن لەبەر هۆز و نەتەوە و حیزب و غەیری ئەمانەش "

وە لە ڕوویەکی ترەوە موسلمانان هەندێکیان هەندێکی تر سەردەخەن لەبەر دینی الله تعالی ، جا ئەگەر کافران هەستان بە دەست بەسەر داگرتنی وڵاتێک وە زاڵ بوون بەسەر موسلمانان لەم وڵاتەدا ئەوا موسلمانان لە هەموو ووڵاتەکانی تردا دێن ئینجا موسلمانان سەردەخەن لەم وڵاتەدا ئەگەرچی لە ڕەگەزی خۆیان نەبن وە لە نەوەی

وڵاتەکانی خۆیان نەبن ، لەبەرئەوەی موسلمانان هەندێکیان دۆستایەتی و پشتیوانی هەندێکی تریان دەکەن لەسەر دینی الله.

- بەڵام ئەگەر موسلمانان دۆستایەتی و پشتیوانی یەکتریان نەکرد لەسەر دینی الله سبحانه وتعالى ، ئەوا بەڕاستی لەدوای ئەمەوە موسلمانان هەندێکیان هەندێکی تر سەرناخەن ئەگەر کافران زاڵ بوون بەسەریاندا ، لەبەرئەوەی دۆستایەتی و پشتیوانی و سەرخستن لەسەر دینی الله سبحانه وتعالى حساب ناکەن.

بەڵکو بێگومان لەسەر پەیوەندی و یەکگرتنەکانی تر حساب دەکرێت " وەک : قەومیەت و نەتەوە و حیزب و غەیری ئەمانەش "

وە ئەم مانایەش لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە الله تعالى دەفەرموێت : { وَالَّذينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ }

واتە : وە ئەوانەی کە بێ بڕوان هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن ، ئەگەر ئەوە (پشتیوانییە) نەکەن لە زەوی دا ئاژاوە و فەساد و بەد خوویەکی گەورە بەرپا دەبێت

[ سورەتی الأنفال : 73 ــ تەفسیری پوختە ].

- وە مانای ئەم ئایەتە : کافران هەندێکیان دۆستایەتی و پشتیوانی هەندێکی تریان دەکەن ، وە بۆ ئیمانداران نییە دۆستایەتی و پشتیوانیان بکەن بە سەرخستن یان لەبەر میراتێک یان غەیری ئەمانەش.

- پاشان الله تعالی دەفەرمویّت : {إِلاَّ تَفْعَلُوهُ} واتە : ( ئەگەر ئەو کارە نەکەن )

واتە : ئەگەر ئێوەش دۆستایەتی و پشتیوانی موسلمانان نەکەن هەروەکو چۆن کافران هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریان دەکەن.

- { تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ } واتە : ( لە زەوی دا ئاژاوە و فەساد و بەد خوویەکی گەورە بەرپا دەبێت ) بەهۆی بەهێزبوونی کوفر و لاواز بوونی ئیسلام .

وە ئەمەش فەرمانێکی ئاشکرا و ڕاستەوخۆیە ( لە لایەن الله تعالی ) ، چونکە کافران هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تر دەکەن لەسەر کوفر ، جا جیاوازی و ناکۆکی نێوانیان لەگەڵ یەکتری هەرچۆنێک بێت ، ئەوا ئەوان لەوکاتەدا هاوپەیمانی دەبەستن دژی موسلمانان و هەندێکی تریان سەردەخەن لەسەر ئەم کوفرە.

وە لە دوای ئەمەوە جا ئەگەر موسلمانان هەندێکیان دۆستایەتی و پشتیوانی هەندێکی تریان نەکرد ئەوا کافران زاڵ و سەرکەوتوو دەبن بەسەر موسلماناندا ، وە ئا ئەمەش لەبەر نەبوونی موالات و دۆستایەتی موسلمانانە بۆ هەندێکی تریان .

بەڵام ئەگەر موسلمانان هەندێکیان پشتیگیر و یارمەتیدەری هەندێکی تریان بوون ئەوا کافران ناتوانن زاڵ بن بەسەر موسلماناندا .

- وە ئا ئەمەش مانای ئەو ئایەتە بوو کە لە پێشوودا باسکرا لە سورەتی " الأنفال " ئەو ئایەتەی کە مێژوو و واقیع و عەقڵ چەسپاندوویەتی .

وە گەورەترین نموونەش لە پشتیوانی و دۆستایەتی کافران و نەبوونی پشتیوانی و دۆستایەتی ئیمانداران :

دەبینین کەوا موسلمانان لە ئەندەلوس کاتێک کە لە صراع و ململانێ دابوون لەگەڵ گاورەکانی باکور عادەتیان وا بوو یەکتریان سەردەخست بەسەر گاورەکان لە هەرکاتێکدا گاورەکان ویستبایان بچن بۆ ململانێ لەگەڵیان.

▪ جا کاتێک موسلمانان دابەش بوون بۆ چەند میرنشینێکی بچووک و ناکۆکیان تێکەوت ئەوا لە بەرامبەردا دەستەڵاتدارەکانی گاوڕەکان یەکیان گرت لە باکوردا ئینجا گەیشتنە دەر ئەنجامێک.

▪ کە گاوڕەکان توانیان زاڵ بن بەسەر موسلمانان لە زۆربەی جارەکان ، چونکە کاتێک ویستبایان جەنگ لەگەڵ میر نشینێک لە میر نشینەکانی موسلمانان بکەن ، کە گەیشتبووە نزیکەی ( 21 میر نشین ) کە لەم کاتەدا پێی دەگوترا ( عصر ملوك الطوائف ) واتە : سەردەمی پادشایەتی تایەفەکان.

▪ جا کاتێک گاوڕەکان ویستبایان جەنگ لەگەڵ میر نشینێک لە میر نشینەکانی موسلمانان بکەن دراوسێکانی ئەو میر نشینە عادەتیان وابوو کە ئەو میر نشینەیان سەرنەدەخست ، بۆیە زۆر بە خێرایی ئەو میر نشینە دەشکا و شکستی دەهێنا لەسەر دەستی گاورەکان.

▪ بەڵکو زۆربەی جارانیش ئەم شکانە ڕوویدەدا کە یەکێک لە ئەمیرەکان خائین و موڕتەد بوو گاوڕەکانی سەردەخست دژی موسلمانان.

▪ بارو دۆخەکە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو ئەو میر نشینانە بۆ موسلمانان نەمایەوە بێجگە لە میر نشینی " غرناطة " نەبێت ، وە چەند ناوچەیەکی تری بچووک نەبێت لە باشوور.

▪ وە لەگەڵ ئەوەیشدا بینیمان کەوا أبا عبد الله الكبير هاوپەیمانی ئەبەستێت لەگەڵ گاورەکان دژ بە براکەی ، نەوەک هەر ئەوە بەڵکو خێزانە گاورەکەی ڕازی ئەکات و خێزانە عەرەبە موسڵمانەکەی و کوڕەکەی سجن ئەکات بۆ ڕازی کردنی گاورەکان !!

▪ بە هەمان شێوە کاتێک کوڕەکەی کە ناوی أبو عبد الله الصغير دەستەڵاتی گرتە دەست هاوپەیمانیەتی بەست لەگەڵ گاورەکان دژ بە مامی تاوەکو گاورەکان وڵاتی مامەیان داگیرکرد و هیچیان نەدایە ئەم.

پاشان دەستبەجێ إنقلابیان کرد بەسەریدا وە ئا لەم جێگایەشدا شوێنێکی دیاری کراو نەمایەوە بۆ موسلمانان بۆیە زۆر بەخێرایی شکان و شکستیان هێنا .

▪ بەم شێوەیە بوونی ئیسلامەتی کۆتایی هات لە ئەندەلوس ـدا لەدوای جێگیر بوونی نزیکەی هەشتا سەدە لە ئەندەلوس !!!

پاشان لەم کاتەدا بووە چەرخێکی نوێ ، وە ئەرک و کارو بارەکەش بووە خراپترینی زوڵم و تاریکایی چونکە گاوڕەکان داگیر کاریان کرد لە " ئینگلترا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا و هۆڵەندا " وە زۆربەی وڵاتانی موسلمانان .

∮ وانـەی چـل و نــۆ ( 49 ) ∮

((دوای ئەوەی کە زانیمان لە کۆتایی هاتنی بوونی ئیسلامەتی لە ئەندەلوس ـدا وە هۆکاری ئەمەش بریتی بوو لە لەیەک ترازان و لێک جودا بوونەوەی ئومەتی ئیسلامی ، جا لەم چەرخە نوێیە گاوڕەکان داگیر کاریان لە زۆربەی وڵاتانی موسلمانان کرد))

وە بیرمەندەکان و قەشەکان و سیاسیەکان دەستیان کرد بە ئامادە کاری بۆ خوێندن و وانە گوتنەوە بە موسلمانان بە شێوەیەکی لەسەرخۆ ، هەتاوەکو عەقیدە و بیرو باوەڕی ئیسلام دەربهێنن لە دڵی موسلمانان.

- وە هەتاوەکو خیلافەتی ئیسلامیان نەهێشت و لابرد لە هەبوونی کۆتایی پێ هاتوو ، وە هەتاوەکو دەستەڵاتیان نەبێت بەسەر وڵاتی موسلمانان ، نەوەک بە تەنها بە دەستەڵاتێکی سەربازی بتوانێت هێزیان نەهێڵێت.

جا لێرەدا ژمارەیەک شتیان خستە ڕوو بۆ ڕووخاندنی ئیسلام و عەقیدەکەی و شەریعەتەکەی لە دڵی شوێنکەوتوانی ، وە پێشکەش کردنی چەندین جێگرەوەی مزخرفە و نەخشێنراو ، وەک بەدیل و جێگرەوە لە شوێنیان.

جا لێرەدا ئەم فکرانەیان خستە ڕوو :

⊖ ( الانتماء للوطن ) و ( الانتماء للأحزاب )

واتە : لایەنگیری کردن بۆ نیشتیمان وە لایەنگیری کردن بۆ حیزبەکان .

▪ وەک بەدیلێک لەجیاتی لایەنگیری کردن بۆ ئیسلام وە لە جیاتی پەیوەندی و یەکگرتنی خیلافەت ئەو خیلافەتەی کە هەموو موسلمانانی لەژێردا کۆدەکردەوە بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان موسلمانێکی میسرِی و موسلمانێکی سوری و موسلمانێکی عێراقی.

وە هەتاوەکو فکرە و بیرۆکەکەیان نەجاحەتی هێنا ، چونکە ئەوان دڵیان بە ژمارەیەک ڕێگا خۆش بوو :-

- یەکەم : دەبێت ئەوانەی کە هەڵدەستن بەم گۆڕانکاریە لە ڕووکەشدا خۆیان بدەنە پاڵ ئیسلام ، وە خۆیان بدەنە پاڵ ڕەگەزی موسلمانان، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان لە حەقیقەتدا خۆشیان پاڵ نەئەدایە بۆ ئاینی ئیسلام ، تەنها بە ناو نەبێت ، بەڵکو ئەوان بە تەواوی پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ڕۆژئاوای گاوڕ ، وە لەسەر ئامادەکاریەکی تەواو بۆ لە خۆ گرتنی هەموو ئەفکارەکانیان و ڕەواج پێدانیان لەنێوان موسلماناندا ، بە شێوەیەک کەوا قەبوڵی ئەفکارەکانیان بکرێت ئەگەرچی بگاتە هەر حەددێک ، لەگەڵ ئەوەی لە ڕووکەشدا خۆیان پاڵ ئەدایە بۆلای ئیسلام .

- دووەم : هەموو ئەو خاڵانەی کە دانراون بەسەر موسلمانانندا دەبێت لەژێر درووشمی نوێی ڕازێنراو و نەخشێنراو بێت ، تەعبیر و لێکدانەوە نەکات لە بەریەک کەوتن و لێکدانێکی وازح و ڕوون لەگەڵ ئیسلام و عەقیدەکەی ، بە شێوەیەک بێت کەوا ڕەفز کردنەوەی ئەو ئەفکارانە ڕوو نەدات لە دەرئەنجامی بەریەک کەوتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئیسلام .

- سێیەم : دەکرێت خاڵە دانراوەکان لەگەڵ ئەندازەیەک بێت لە شوبهە و گومانەکان هەتاوەکو هەموو ئەم خاڵانەی کە دانراون وا ببینرێت و دەرکەوێت وەک ئەوەی کە شەرعیە و پێچەوانە و دژ نییە لەگەڵ ئیسلام ، لەگەڵ ئەوەش حەقیقەتەکەی دەرچوونە لە ئیسلام و شەریعەتەکەی.

- چوارەم : ئەم خاڵانەی کە دانراون دەبێت گشتگیر بێت لە هەموو بوارەکاندا پێچەوانەی ئیسلام بێت .

جا هەندێکی ڕوخاندنی حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلامی لە خۆی دەگرت لەژێر درووشمەکانی ( عەلمانیەت و دیموکراسی و لیبڕالیەت) ، وە هەندێکی تری بانگەشەی دەکرد بۆ حەڵاڵ کردنی حەڕام کراوەکان لەژێر درووشمی ( هونەر و داهێنان و فیکرەی ئینسانی ).

وە هەندێکیش هێرشی دەکردە سەر حوکم کردن بە ئیسلام بە باوەڕ پێ کردنی حوکمی دیموکراسی یان ( حوکم کردنی الإلهي ) " لە حەددی بانگەشە کردنیان "

وە هەندێکیش بانگەشەیان دەکرد بۆ سوڕانەوە لەژێر درووشمی ( قەومیەتی عەرەبی و لایەنگیری کردنی نیشتیمانی وە هەروەها لایەنگیری کردنەکانی حیزبی ) هتد.

- پێنجەم : دەبێت بە تەواوی ئەوانەی بانگەوازکارانی نوێن بەرزبکرێنەوە ، ئەوانەی هەوڵی ڕووخاندنی ئیسلام ئەدەن دەبێت بەرز بکرێنەوە بۆ بەرزترینی شوێنەکان وە پێدانی لەقەبی بەرز پێیان ، جا ئەمەیان ( نوێکەرەوەی ڕۆژهەڵاتە ) وە ئەمەیان ( سەرۆکی ئەدەبی عەرەبیە ) وە ئەمەیان ( خاوەنی فیکرەیەکی ڕووناک کەرەوەیە ) وە ئەمەیان ( سەرۆکی بەخشەرەکانە ) وە ئا بەم شێوەیە.

وە ئا ئەم خاڵانە بوو کە بەهۆیانەوە دەیانویست لەلای خەڵکی ئیسلامی پێ لەناو ببەن وە ئەم خاڵانەیان دەکردە جێگرەوە و بەدیل لە جێگای پەیوەندی و یەکگرتنی (دۆستایەتی لەسەر دینی الله)

- جا بە تەواوی درووشمی ( نیشتیمان پەروەری ) و ( قەومیەتی عەرەبی ) بەرزکرایەوە وەک جێگرەوە لە شوێنی ئیسلام و لە شوێنی سوڕانەوە بە دەوری ئاڵای ( خیلافەتی ئیسلامی ) وە سەرقاڵ کردنیان لە بنچینەی کارەکەدا.

وە لە ڕوویەکی تریشەوە بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا زاڵبوون کۆمەڵێک لە کافران :

لە سەرووی هەموویان ( کمال أتاتورک ) کە لە زێدی بنەماڵەی ( یهودی الدونمة بوو ) وە أتاتورکی ناوبراو هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی گرتە ئەستۆ لە ساڵی ( 1924 ) لە مانگی مارس .

- وە بانگدانی بە زمانی عەرەبی هەڵوەشاندەوە ، وە شەریعەتی ئیسلامی هەڵوەشاندەوە وە ڕێگەدان و حەڵاڵ کردنی کارکردن بە یاساکانی سویسڕی و ئیتاڵی و جگە لەم دووانەش.

- وە مەنعی حیجابی کرد لە هەموو پەیمانگاکانی خوێندن و کارکردن ، وە مەنعی پۆشینی الطربوش ـی عوسمانی کرد ( الطربوش : کڵاوێکی سووری خڕە ) ، وە ئا بەم شێوەیەی کرد.

وە هاوڕێی ئەم کارە بەڵکو پێش ئەو کارە دوو بانگەواز بوو :-

أ ) بانگەوازی کردن بۆ سوڕانەوە بە دەوری ( الجنس الطوراني ) " کە ڕەچەڵەکی ڕەگەزی تورکەکانە " لە جێگای سوڕانەوە بە دەوری ( پەیوەندی خیلافەت ) .

ب ) لە خۆگرتنی سیاسەتی بە تورکی کردن لە جیهانی ئیسلامی ، واتە : ڕێگە پێدان بە زمانی تورکی لە خوێندنگاکان و دامو دەزگاکانی حکومەت وە کردنی بە زمانێکی ڕەسمی لە دیوانەکانی وڵاتانی عەرەبی.

- کاردانەوەکان لەسەر ئەمە ئامادە کرا لە سەرانسەری جیهانی عەرەبی جا هەندێکیان بانگەوازیان دەکرد بۆ پشت هەڵکردن لە حوکمی تورکی وە بانگەوازیان دەکرد بۆ دامەزراندنی ( خیلافەتی عەرەبی ) وە پاڵێوراو بۆ خیلافەتی عەرەبی (الشریف حسین) بوو.

وە بەکرێگیراوێکی ئینگلیز بوو یان بەلایەنی کەمەوە لەسەر پەیوەندیەکی بەهێز بوو لەگەڵیان ، وە داوایان لێی دەکرد لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەم هاوکاریان بکات لە دژی دەوڵەتی عوسمانی ، لە ساڵانی ( 1914م-1918م )

- وە لە پشتگیری أتاتورک و شوێنکەوتوانی نەبێت ، وە بالفعل الشریف حسین و شوێنکەوتوانی هاوکاریانی کرد هەتاوەکو تورکیا شکستی هێنا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا.

- وە داگیر کاری ڕۆژئاوایی توانی دەست بگرێت بەسەر وڵاتانی عەرەبی ، وە بێجگە لە حوکمی أردن و عێراقی نەبەخشیە الشریف حسین و کوڕەکانی ، وە عبد العزیز بن سعود دەستی گرت بەسەر خاکی حیجاز وە توانی دەریبهێنێت لەژێر دەستی الشریف حسین و غەیری ئەویش.

((ئەو نەخشە کێشان و داگیرکاریانە وە خەڵکیش لەو بێ ئاگاییەی بێ دەستەڵاتیەی تێیدا بوون نەیاندەزانی چ نەخشەیەک لە پشتیانەوە دەکێشرێت !!

- وە ئەمەش هەمووی بە هۆی واز هێنان لە دینەکەیان و واز هێنان لە خۆفێرکردن بوو لە دینەکەیان))

## ∮ وانـەی پـەنـجـــا ( 50 ) ∮

لە وادەی ئەم کاتانەدا دوو فیکرە و بیرۆکە سەری هەڵدا کە هاریکاری و پاڵپشتی داگیرکردنی دەکرد :-

⊖ یەکەم : بریتی بوو لە فیکرەی ( قەومیەتی عەرەبی ) وە بانگەوازی کردن بۆ سوڕانەوە بە دەوری ئەم بیرۆکەیە ، وەک بەدیل و جێگرەوەیەک لە جێگای پەیوەندی و یەکگرتنی ( خیلافەتی ئیسلامی ) .

⊖ دووەم : فیکرە و بیرۆکەی حیزبی ، وە لە دوای کەمێکی تر قسە لەسەر ئەم بابەتەش دەکەین .

▪ جا لە یەکەمیاندا کە بریتی بوو لە فیکرەی : ( نەتەوایەتی عەرەبی ) وە ئەوەشی کە یاوەری ئەو فیکرەیەی دەکرد بریتی بوو لە ( نیشتیمان پەروەری ) ، کە انتماء و لایەنگیری کردنە بۆ نیشتیمان.

بۆیە کەسێکی میسری انتماء و لایەنگیری دەکرد بۆ میسر ، وە کەسێکی عێراقی بۆ عێراق ، وە کەسێکی سوری بۆ سوریا ، وە ئا بەم شێوەیە .

وە هەروەها زیندووکردنەوەی دەمار گیریەکان ( شارستانیە کۆنەکان ) ، جا دەمارگیری فیرعەونی لە میسردا وە دەمارگیری ئاشوری و بابلیەکان لە عێراق وە دەمارگیری " الطورانیة " لە تورکیا ، وە ئا بەم شێوەیە .

وه نوسەرەکان و بیرمەندەکان و ڕۆژنامه نووسەکان و ڕاگەیاندنەکان و پیاوانی فێرکردن بەڵکو زۆرێک له پیاوانی دین ـیش هەستان به بەرزکردنەوە و پیا هەڵدانی انتماء و لایەنگیری کردن بۆ نەتەوایەتی عەرەبی و لایەنگیری کردن بۆ نیشتیمان.

- وه خاوەن ووتارەکان و نوسەرەکان دەستیانکرد بەم کارە یەک لەدوای یەک ، له سەرەتادا به شێوەیەکی نەرم و نیانی لەو شتەی که ئارەزووی منداڵان بۆی دەچێت ، جا لەوانەی که له کتێبەکانی قوتابخانەدا دەخوێندران ( ئەمانەیان فێر دەکردن )

(بلادي التي أحبها ، نشأت على أرضها ، وأظلتني سماؤها ، وشربت من مائها ، وجدودي يختلطون بترابها)

- هەروەها تێپەڕبوون به سرووده‌کانی قوتابخانە و ووتنەوەی گۆرانیەکان لەسەر نیشتیمان پەروەری ، که دووباره دەکرانەوە ، وەکو : (مصر هي أمي ، نيلها جوّه دمي ، شمسها في سماري ، شكلها في ملامحي ، حتى لوني قمحي ، لون خيرك يا مصر).

- وه ئەو سرووده دەگوتراوە : (حب الوطن فرض عليَّ ، أفديه بروحي وعينيَّ)

- وه ئەوانەشی گۆرانیان دەگوتەوە : (يا أغلى اسم في الوجود ، يا مصر ، يا اسم مخلوق للخلود ، يا مصر ، نعيش لمصر ، نموت لمصر ، تحيا مصر)

بەم شێوەیه ئەمه لەم باسانه ئەژمار ناکرێت که لایەنگیری کردن بۆ ئەوەی ڕۆیشتووه یان ناوەندیه ، بەڵکو هەوڵیان ئەدا بۆ عەقیدەیەکی نوێ ، به مانادار کردنی هەموو ووشەیەک له مانایەکی خۆی.

▪ هەتاوەکو ئەوان ناویان لەم عەقیدەیە نا بە ( عەقیدەی نیشتیمان پەروەری ) ، بەم هۆیەوەش جیهاد کردن بوو بە جیهاد کردن لە پێناوی نیشتیمان ، وە شەهیدی ئەوەیە کە شەهید بوونە لە پێناوی نیشتیمان یان شەهیدی واجب و نیشتیمان ، یان شەهیدی الله و نیشتیمان.

▪ " لەسەر حەدی نوسینەکانیان " وە پلەو پایەی هەموو کەسێک دیاری دەکرێت بە گوێرەی ئەوەندەی ئەو کەسە لایەنگیری هەیە بۆ نیشتیمان پەروەری ، وە دەستەواژەی ( هاوڵاتی بوون ) شوێنی ( موالات و دۆستایەتی کردن لەسەر دینی الله ) دەگرێتەوە، وە خیانەت و ناپاکیش بوو بە خیانەتی نیشتیمان " بەم واتایە دێت : لە حەقیقەتی ئەمەدا خیانەت و ناپاکی کردن لە سیستەمی حاکم و فەرمان ڕەوا "

▪ بەڵکو هەندێکیان بانگەشەیان دەکرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی خانەی ئاینی لەسەر کارتی ناسنامە ( البطاقة ) ، وە إکتفاء کردن بە ( المواطنة ) " واتە جنسیە " ،

▪ بەبێ جیاکردنەوەی نێوان موسلمانێک و گاوڕێک " مەسیحیەت لەسەر حەدی لێکدانەوەی خۆیان " بەڵکو بینیمان لە هەندێک لە گاوڕەکان داوای ڕێگا پێدانیان دەکرد بۆ زەواج کردن لەگەڵ ئافرەتانی موسلمان، وە بەڵگەیان لەسەر ئەم کارە دەهێنایەوە بەوەی کە ئەوان نامۆن لە وڵاتانی خەلیج (بە مانای موسلمانان دێت لە سعودیە و وڵاتانی خەلیج) جا هاوسەرگیریان دەکرد لەگەڵ ئافرەتە میسرِیەکان.

بۆیە هاوسەرگیری کردنیان لەگەڵ گاوڕێکی میسری لەپێشترە لەوەی کە لەگەڵ ئافرەتە موسڵمانەکانی میسرِ بکەن ، بە إعتباری ئەوەی کە ئەوان خەڵکی یەک وڵاتن ، بۆیە یەکگرتنیان بەهێزترە و نزیکترە لە نامۆکان "ئەهلی خەلیج" !!

- وە بینیمان کە درووشمانێک بەرز دەکرایەوە لە ڕۆژنامە و ووتار و نوسەرەکاندا کە دەیانگووت : ( یحیا الهلال مع الصلیب ).

- لەگەڵ ئەوەی کە خاچ درووشمی کوفرە وە ڕەمزی دینی گاوڕی فەوتاوە ، لەبەرئەوەی وا بانگەشە دەکەن کە مەسیح لە خاچ دراوە .

لەکاتێکدا الله تعالی لە قورئاندا دەفەرموێت : { وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ }

واتە : لەکاتێکدا نەشیان کوشتبوو وە هەڵیشیان نەواسی بوو بەڵکو لێیان گۆڕدرا.

[ سورەتی النساء : 157 ــ تەفسیری پوختە ]

- وە بەرزیان دەکردەوە درووشمی ( دین بۆ الله و نیشتیمان بۆ هەمووان ) بەهۆی ئەم کارەوە دەیانویست کەوا هیچ نیشانەیەک نەبێت بۆ جیاوازی لەنێوان موسڵمان و گاوڕێک یان یەهودیەک ، چونکە هەموویان ڕۆڵەی یەک نیشتیمانن جیایان ناکاتەوە تەنها بە ئەندازەی لایەنگیری کردن نەبێت بۆ ئەو نیشتیمانە.

وە ئەمەش باطل و پووچە لەبەرئەوەی الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت :

{أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ}

واتە : ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دادەنێین ( لەدوا ڕۆژدا ، نەخێر وانییە ) یا پارێزکاران وەك بەد کرداران لێ دەکەین [ سورەتی ص : 28 ـ تەفسیری پوختە ].

وە ئەمەش پرسیار لێکردنێکە بەشێوەی ئینکاری کردن لەلایەن الله تعالى بۆ کەسێک کە یەکسانی دەکات نێوانی ئەو ئیمانداراانەی کە کردەوە چاکەکان ئەنجام ئەدەن وە لەگەڵ نێوانی خراپەکاران لە زەویدا ، وە ئا بەم شێوە هەرگیز یەکسان نییە نێوانی موتەقی و لە خـودا ترسەکان لەگەڵ بەد کارو خراپەکارەکان .

وە بێگومان بەم شێوە الله تعالى دەفەرموێت : {أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ}

واتە : ئایا ئەوانەی کە خراپەکانیان کردووە وا گومان دەبەن ئێمە ئەوانە وەکو کەسانێ دادەنێین کە بڕوایان هێناوە و چاکەکانیان کردووە وەکو یەك بێت ژیانیان و مردنیان ئای چەند خراپ دادوەری دەکەن [ سورەتی الجاثیة : 21 ـ تەفسیری پوختە ].

واتە : الله تعالى نکۆڵی دەکات لەسەر ئەو کەسانەی کە کردەوە خراپەکان ئەنجام ئەدەن کە ئایا وا دەزانن و گومان دەبەن کە الله سبحانه وتعالى لە ژیانیان و مردنیاندا وەکو ئەو کەسانە لێ دەکات کە ئیمانیان هێناوە و کردەوە چاکەکان ئەنجام ئەدەن بەبێ جیاوازی و هیچ جیاوازیەکیان نییە ؟ !!

- جا ئا ئەمە حوکمێکی زۆر خراپە چونکە شایستە نییە بە الله سبحانه وتعالى ، وە بۆیە الله سبحانه وتعالى لە دوای ئەمەوە دەفەرموێت :

{ سَاء مَا يَحْكُمُونَ } واتە : ئای چەند خراپ دادوەری دەکەن .

جا مرۆڤی ئیماندار هەرگیز لەگەڵ مرۆڤی کافر یەکسان نییە نە لە حوکمەکانی دونیادا، وە نە لە حوکمەکانی قیامەتدا.

▪ وە ئەو درووشمانەی کە بەرزیان کردبوویەوە و بە گەورەیان دادەنا ، کە ولاء و خۆشەویستی دەکات بە دەوری نیشتیماندا ، هەر ئەوەش نا بەڵکو زۆربەی هەر هەمان حاڵی ئەهلی جاهیلیەت و حاڵی تەتارە یاخی و دەرچووەکانن لە ئیسلام.

▪ چونکە ئەهلی جاهیلیەت دۆستایەتی و پشتیوانیان لەسەر قەبیلە و هۆزێک دەکرد، جا یەکسانە کە ئەو هۆزەش لەسەر حەق بوونایە یان لەسەر زوڵم و ستەم بوونایە.

▪ لەبەرئەوەی دەمارگیریان و دۆستایەتیان دەسوڕایەوە بە دەوری قەبیلە و هۆزێک کە انتماء و لایەنگیریان بۆی هەبوو ، وە دەبوونە سەرخەر و پشتیوان بۆ بەرزکردنەوەی ئەو هۆزە بەسەر هۆزەکانی تر.

▪ هەروەکو چۆن یەکێکیان کە لەبارەی ئەمەوە نوسیویەتی و دەڵێت :

وهل أنا إلا من غُزَيَّة إنْ غوت *** غويت ، وإنْ ترشد غزية أرشد .

واتە : وە من ئیلا لەو هۆزەم ئەگەر گومڕا بێت *** گومڕا دەبم ، وە ئەگەر هۆزەکەم هیدایەت بدرێت ئەوا منیش هیدایەت وەردەگرم .

مانای ئەم جاهیلیەتە کە لە هۆزی ( غزية )ـدایە ئەگەر هۆزەکەی سەرلێشێواو و گومڕا بێت ئەویش لەگەڵ هۆزەکەی سەرلێشێواو و گومڕا دەبێت ، وە ئەگەر لەسەر ڕێنمایی بوو ئەوا ئەویش لەسەر ڕێنمایی دەڕوات ، ئەوا ئەو کەسە هەر شوێنکەوتەیە بە شێوەیەکی ڕەها لەسەر هەموو حاڵێک.

وە ئەمەش وەک حاڵی ئێستاکەیە کە انتماء و لایەنگیریان هەیە بۆ نەتەوەیی ئەوەی کە مرۆڤ پابەند دەکات بە شوێنکەوتنی ڕاو بۆچوونی فەرمانڕەواکان هەتاوەکو ئەگەر ئەو ڕاو بۆچوونە کوفر بێت یان باطل و ناحەق بێت ، وە ئەمەش هەمان حاڵی تەتارەکان بوو.

هەروەکو چۆن شیخ الإسلام إبن تيمية ( رەحمەتی الله لێی بێت ) لە وەسفیاندا دەفەرموێت : (وهم يقاتلون على ملك جنكسخان ( يعني ملكهم جنكزخان )، فمن دخل في طاعتهم جعلوه وليًا لهم ، وإن كان كافرًا ، ومن خرج عن ذلك جعلوه عدوًا لهم وإن كان من خيار المسلمين ، ولا يقاتلون على الإسلام ولا يضعون الجزية والصغار)

واتە : ئەوان لەسەر موڵکی جەنگیزخان دەجەنگن ، ( واتە : پادشاکەیان جەنگیزخان ) ، جا هەرکەسێک بچێتە ژێر گوێڕایەڵی ئەوانەوە ئەوا ئەوان دەیکەن بە وەلی خۆیان ، ئەگەرچی کافریش بێت ، وە هەرکەسێکیش نەچێتە ژێر گوێڕایەڵیانەوە دەیکەن بە دوژمنی خۆیان ، ئەگەرچی لە چاکترینی موسڵمانانیش بێت ، وە لەسەر دینی ئیسلام ناجەنگن ، وە جزیەش وەرناگرن .

جا لێرەدا إبن تیمیة ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) وەسفیان دەکات بەوەی کە ئەوان لەگەڵ خەڵکی دەجەنگن هەتاوەکو خەڵکی بخەنە ژێر گوێڕایەڵی پادشاکەیان.

- جا ئەو جەنگەی کە ئەوان دەیکەن لە پێناوی الله تعالی نییە ، بەڵکو لە پێناوی سەرخستنی پادشاکەیانە.

- وە بۆیە هەرکەسێک بچێتە ژێر گوێڕایەڵی ئەوانەوە ئەوا ئەو کەسە لەخۆیان نزیک دەکەنەوە و دەیکەن بە وەلی بۆ خۆیان لەبەرئەوەی ولاء و دۆستایەتی هەیە بۆیان ، لەسەر موڵکیان ، هەتاوەکو ئەگەر کەسێکی کافریش بێت !!!

- وە هەرکەسێکیش لەم گوێڕایەڵی کردنە دەرچوو ئەوا ئەو کەسە دەکەنە دوژمنی خۆیان.

" چونکە ئەو کەسە دوژمنی نیشتیمان و سیستەمە "

وە ئەگەرچی لە باشترینی موسڵمانانیش بێت ، بۆیە ئەوان ناجەنگن بۆ سەرخستنی ئیسلام وە ناجەنگن بۆ بەرزکردنەوەی شەریعەتی ئیسلامی یان حوکم کردن پێی ، وە جزیەش وەرناگرن لە ئەهلی کتاب و ملکەچیان ناکەن ،

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت :

{ قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ }

واتە : جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بە خـودا و بە ڕۆژی دوایی ، وە بە حەرامی دانانێن ئەوەی کە خـودا و پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە ، وە مل کەچ ناکەن بۆ ئایینی ڕاست لە ئەوانە کتێبیان پێ بەخشراوە هەتا باج و سەرانە دەدەن بە دەستی خۆیان و بە مل کەچی لە کاتێکدا ئەوان سەر شۆڕو ڕیسوان .

[ سورەتی التوبة : 29 ــ تەفسیری پوختە ]

جا لێرەدا الله تعالی فەرمانی کردووە بە جەنگ کردن لەگەڵ ئەهلی کتاب کە ئەوانیش ( یەهود و گاوڕەکانن ) هەتاوەکو دەچنە ژێر حوکمی موسلمانان وە جزیەش لێیان وەردەگیرێت لە کاتێکدا کە زەلیل و سەرشۆڕن.

- ئا ئەوەیە حوکمی الله تعالی بۆ ئەهلی کتاب ، بەڵام ئەوەی کە خەڵکی بۆ جاهیلیەت دەبات.

- وە لەویش ( موالات و دۆستایەتی کردنە لەسەر غەیری دینی ئیسلام ) دەرئەنجامەکەشی دەبێتە ( انتماء و لایەنگیری بۆ نیشتیمان ) کە ئەویش بریتییە لە دەستەواژەی ( نیشتیمان پەروەری ) کە ئەویش بووەتە ئەو پەیوەندی و یەکگرتنە کە خەڵکی بە دەوریدا دەسوڕێتەوە.

- وە لە دوای ئەمەشەوە جیهاد کردن بووەتە جیهادی لە پێناو نیشتیمان ، وە دوژمنیش ئەو کەسەیە کە دوژمنی نیشتیمانە ، نەوەک کەسێکی کافر.

▪ بەڵام مرۆڤی کافریش مادام یەکێکە لە دانیشتوانی ئەو نیشتیمانە ئەوا ئەو کەسە برایە لەلایان لەبەر نیشتیمان.

وە لێرەشدا ئەم فەرموودەیەی رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) باس دەکەین :-

عن أبي موسى الأشعري ( رضي الله عنه ) قال : سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً ، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً ، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً ، أَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللهِ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) : « مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا ، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ »

واتە : لە ئەبو موسای ئەشعەری ـەوە ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت :

پرسیار کرا لە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی پیاوێک کە بۆ ئازایەتی شەڕ دەکات ، وە پیاو هەیە بۆ دەمارگیری و خزمایەتی شەڕ دەکات ، وە پیاویش هەیە بۆ ڕیاء و ڕوو پامایی شەڕ دەکات ، ئایا هیچ کام لەمانە لە پێناوی الله ـیە ؟ پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( هەرکەسێک بجەنگێت بۆ بەرز کردنەوەی کەلیمەی الله ، ئەوا هەر ئەویان لە پێناوی الله ـیە ) .

– کەواتە ئەو جەنگە لە پێناوی الله ـیە کە تاکە مەبەست و ئامانج و بەرژەوەندی لێی بەرزکردنەوەی دینی الله ـیە ، وە شەریعەتی الله ـیە ، وە بۆ بەرزکردنەوەی کەلیمەی الله ـیە ، بەڵام ئەو جەنگانەی کە لە پێناوی ئامانج و مەبەست و بەرژەوەندیەکانی ترە ئەوا ئەو جەنگە لە پێناوی طاغوتە .

∯ وانـەی پـەنجـا و یەک ( 51 ) ∯

## الخاتمة ــ بەشی کۆتایی

**[ کۆتایی : ئایا تەحقیقی تەوحیدت کردووە و هێناوتەدی ؟**

**وە ئایا تەحقیقی ئیمان هێنان بە الله و کوفر کردن بە طاغوتت کردووە و هێناوتەدی ! ]**

**الحمد لله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ( صلى الله عليه وسلم ) .**

**وە لە دوای ئەوەی کە باسی گرنگیەتی تەوحید ـمان کرد وەک أصل و بنچینە بۆ ئەو دینە ، وە وەک مەرجێک بۆ سەلامەتی دین چونکە کردەوە چاکەکان قبوڵ نابێت بەبێ ئەو ، وە ڕوونمان کردەوە کە موشریکەکانی سەرەتا إقراریان دەکرد و دانیان ئەنا بە هەبوونی الله سبحانه وتعالى وە دانیان ئەنا کە هەر الله خۆی ئەوانی درووست کردووە و رزق و ڕۆزیان ئەدات و دەستەڵاتی هەموو شتێکی بە دەستەوەیە ، وە لەگەڵ ئەوەشدا شیرک و هاوبەشیان بڕیار ئەدا لەبەرئەوەی بت و پەیکەرەکانیان دەکردە ( واسطة ) لەنێوان خۆیان و لەنێوان الله سبحانه وتعالى لە پاشانیشدا لەبەر ئەو پەیکەرانە ئەپاڕانەوە ، وە داوای فریاکەوتن و پەنایان بۆ دەبردن ، وە ئاژەڵیان بۆ ئەو پەیکەرانە سەر دەبڕی وە جگە لەوانەش .**

( جا وا گومانیان ئەبرد کە ) لە ڕێگای ئەم بتانەوە " پەیکەری پیاو چاکەکان " ئەوا ئەوان دەبنە شەفاعەت و تکاکار بۆیان لەلای الله ، وە لە ڕێگای ئەم بتانەوە نزیکیان دەکەنەوە لە الله سبحانە وتعالی ، هەروەکو چۆن الله سبحانە وتعالی لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلى اللَّهِ زُلْفَى }

واتە : وە کەسانێ جگە لەو ( خـودا ) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە ( دەڵێن ) تەنها لەبەر ئەوە دەیان پەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خـودا.

[ سورەتی الزمر : 3 ــ تەفسیری پوختە ]

وە هەروەکو چۆن الله تعالی لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَـؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ } واتە : ئەوانە بێجگە لە خـودا شتانێك دەپەرستن کە نە زیانیان پێ دەگەیەنن نە سوود و قازانج ، وە دەڵێن ئەو بتانە تکا کارمانن لای خـودا [ سورەتی یونس : 18 ــ تەفسیری پوختە ].

وە بەم شێوەیەش موشریکەکان کەوتبوونە ناو شیرکێکی تر ، کە ئەویش بردنەوەی حەڵاڵ کردن و حەڕام کردنە بۆ غەیری الله.

- جا ئەوەی الله حەڕامی کردبوو ئەوان حەڵاڵیان دەکرد ، یان ئەوەی الله حەڵاڵی کردبوو ئەوان حەڕامیان دەکرد ، ببوونە شوێنکەوتەی کاهین و گەورەکان وەکو ( عمرو بن لحي ) وە غەیری ئەویش.

وە ئا ئەمەش هەروەکو چۆن الله سبحانه وتعالى لەبارەیانەوە دەفەرموێت : { أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ } واتە : ( ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بە بەرنامەی خـودا ) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەڕانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی خـودا مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت ( حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن ) [سورەتی الشورى : 21 ــ تەفسیری ئاسان].

جا هەرکەسێک شەرع و بەرنامەیەکی دانا لەکاتێکدا الله تعالى هەرگیز مۆڵەتی بەم کارە نەداوە وە هەروەها خەڵکیشی پێیەوە پابەند کرد ئەوا ئەو کەسە خۆی کردووەتە شەریک و هاوبەش بۆ الله سبحانه وتعالى ، وە هەروەکو چۆن الله تعالى لەبارەی یەهود و گاوڕەکانەوە دەفەرمویت : { اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا }

واتە : ( گاور و جوو ) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خـودا ( ملکەچ و فەرمانبەرداریانن ، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن ) ، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش ( بە کوڕی خـودا دەزانن ) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خـودایەک.

[ سورەتی التوبة : 31 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە بەم شێوەیەش موشریکەکان کەوتبوونە ناو ولاء و دۆستایەتی و پشتیوانی کردن لەسەر غەیری دینی الله ، جا هەندێکیان دۆستایەتی و پشتیوانی هەندێکی تریان دەکرد لەسەر هۆز و عەشیرەتی کوێرانە ، وە لەپێناوی هۆز و عەشیرەت خوێنی یەکتریان دەڕشت وە ئابڕوو و ناموسی یەکتریان ئەبرد.

جا ئیسلام هات بۆ جێگیر کردنی ولاء و دۆستایەتی و پشتیوانی بۆ الله و پێغەمبەرەکەی و ئیماندارا‌ن لەشوێنی کافرەکان.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : {إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ}

واتە : بێگومان دۆست و یارمەتی دەری ئێوە تەنها خـودا و پێغەمبەرەکەیی و بڕوادارانن ئەوانەی کە بە ڕێک و پێکی نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنن و زەکات ئەدەن ، بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خـودا [ سورەتی المائدة : 55 ـ تەفسیری پوختە ].

وە لە بەرامبەردا الله سبحانە وتعالی نەهی کردووە و ڕێگری کردووە لە موالات و دۆستایەتی کردنی کافران و دەربڕینی خۆشەویستی بۆیان.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً }.

واتە : نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران ، وە هەرکەسێک وابکات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خـودادا نامێنێ مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێیان [ سورەتی آل عمران : 28 ـ تەفسیری پوختە ].

وە هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إَنِ اسْتَحَبُّواْ الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ } واتە : ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە باوك و براکانتان دامەنێن ( هەڵمەبژێرن ) بە دۆست و خۆشەویست ئەگەر بێ باوەڕییان لە باوەڕ لا خۆشەویست ترو چاکتر بوو ، وە هەرکەس لە ئێوە ئەوانە بکات بە دۆستی خۆی ئەوە هەر ئەوانە ستەمکارن [ سورەتی التوبة : 23 ـ تەفسیری پوختە ]>

جا بەم شێوەیە شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله دابەشکراو بوو بەسەر :-

⊖ ① توجیهـ کردن و ئاراستە کردنی عیبادەتەکان و درووشمەکان و ڕێ و ڕەسمەکانی بەندایەتی بۆ غەیری الله .

⊖ ② وە بردنەوەی حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن بۆ غەیری الله .

⊖ ③ وە ولاء و دۆستایەتی و پشتیوانی کردن لەسەر غەیری دینی الله سبحانە وتعالی .

وە لە بەرامبەریشدا تەوحیدە کە لە أصلەکەیدا ئەمانە دەگرێتەوە :-

① بە تاک دانانی الله تعالی لە درووشمەکان و ڕێ و ڕەسمەکانی بەندایەتی و هەموو شێوازەکانی عیبادەت و خـواپەرستی .

② وە بە تاک دانانی الله تعالی لە یاسادانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن .

③ وه به تاک دانانی الله تعالی له ولاء و دۆستایەتی کردندا ، وه ئەوەشی که له دوای ئەوەوه دێت له ولاء و دۆستایەتی و پشتیوانی کردن بۆ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ، وه ولاء و دۆستایەتی بۆ ئیماندارا‌ن به ئەندازەی ئیمانەکەیان ، لەگەڵ پچڕاندنی ولاء و دۆستایەتی لەگەڵ هەموو کافران .

وه ئا بەم شێوەیەش ( لا إله إلا الله ) به مانای نەفی و إثبات کردن دێت :-

- نەفی کردنی پەرستن و بەندایەتی له غەیری الله .

- وه به تاک دانانی الله له پەرستن و بەندایەتی بۆ کردنیدا .

## ∲ وانـەی پـەنجـا و دوو ( 52 ) ∲

دەعوە و بانگەوازی کردن بۆ تەوحید ( لا إله إلا الله ) ئەو بانگەوازیە نەفی کردن و إثبات کردن لەخۆی دەگرێت ، کە ئەویش بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بووە ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) ، جا بێگومان الله سبحانه وتعالی لە کتێبە خۆشەویستەکەی دەفەرمویٚت : { وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ }

واتە : سوێند بە خـودا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خـودا بپەرستن و دوورکەونەوە لە ( پەرستنی ) هەر پەرستراوێکی تر ، جا خـودا هەندێکی لەو ( ئوممەتانە ) ڕێنموونی کرد و هەندێکیشیان ( لەبەر خراپیان ) گومڕایی یەخەی گرتن [ سورەتی النحل : 36 ــ تەفسیری پوختە ].

لەم ئایەتەدا زۆر بە ڕوونی ڕوون بووەتەوە کە وظیفة و ئیش و کاری تەواوی پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) بریتی بووە لە دەعوە و بانگەوازی کردن بۆ عیبادەت و بەندایەتی کردنی الله بە تاک و تەنهایی وە دوورکەوتنەوە لە بەندایەتی کردنی طاغوت و هەموو پەرستراوەکانی تر.

- وە عیبادەت و بەندایەتی کردنی الله تعالى تەواو نابێت و بەدی نایەت تەنها بە دوورکەوتنەوە نەبێت لە طاغوت و هەموو پەرستراوەکانی تر، وە لە کاتێکیشدا

بێگومان هەموو پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) هاوڕا و یەکدەنگ بووینە لەسەر بانگەوازی کردن بۆ تەوحید.

- وە هەموو پێغەمبەرێکیش بانگەوازی قەومەکەی خۆی کردووە بۆ ئەو ووشەیە ( لا إله إلا الله )

وە فەرموویانە: ( یا قوم اعبدوا الله ما لکم من إله غیره )

واتە : ئەی گەلەکەم تەنها الله بپەرستن ئێوە هیچ پەرستراوێکتان نییە بێجگە لەو.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ } واتە : وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە ( بەوەی کە ) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نییە کەواتە تەنها من بپەرستن [ سورەتی الأنبیاء : 25 ــ تەفسیری پوختە ].

بۆیە هەمان ئەو ووشەیە لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران دووبارە بوویتەوە ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ).

هەروەکو چۆن الله تعالی لەبارەی نوح ــەوە ( سەلامی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

{ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ }

واتە : سوێند بە خـودا بێگومان ئێمە نووحمان ڕەوانە کرد بۆ لای گەلەکەی وتی : ئەی گەلەکەم تەنها خـودا بپەرستن ئێوە هیچ پەرستراوێکتان نییە بێجگە لەو.

[ سورەتی الأعراف : 59 ــ تەفسیری پوختە ]

وه الله تعالى لەبارەی هود ـەوە ( سەلامی الله لێی بێت ) دەفەرمویت : { وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ }

واتە : وە ناردمان بۆ لای گەلی عاد براکەیان کە هوود ( پێغەمبەرە ) فەرمووی : ئەی گەلەکەم بە تەنها خـودا بپەرستن هیچ پەرستراوێکتان نییە بێجگە لەو ، دەی ئایا ئێوە پارێزکار نابن [ سورەتی الأعراف : 65 ــ تەفسیری پوختە ].

وه الله تعالى لەبارەی صالح ـەوە ( سەلامی الله لێی بێت ) دەفەرمویت : { وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ }

واتە : وە بۆ گەلی سەمودیش صاڵحی برایانمان نارد فەرمووی : ئەی گەلەکەم خـودا بە تەنها بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نییە.

[ سورەتی الأعراف : 73 ــ تەفسیری پوختە ]

ئا بەم شێوەیە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) لەسەر هەمان ووشە هاوڕا و کۆک بووینە وە لەسەر هەمان دەعوە و بانگەواز بووینە.

هەتاوەکو المسیح ( سەلامی الله لێی بێت ) کە گاوڕەکان دەیپەرستن لەکاتێکیشدا الله تعالى لەبارەیەوە دەفەرموێت :

{ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ }

واتە : لە کاتێکدا مەسیح ( کاتێ ڕەوانە کرا ) وتی : ئەی نەوەی ئیسرائیل تەنها خـودا بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەشە ، بەڕاستی هەرکەس هاوبەش بۆ خـودا دابنێ ئەوە بێگومان خـودا بەهەشتی لێ حەرام کردووە ، وە جێ و شوێنی ئاگر دەبێت وە بۆ ئەو ستەم کارانە هیچ یارمەتی دەرێك نییە [سورەتی المائدة : 72 ـ تەفسیری پوختە].

ـ وە ئیبراهیم ( سەلامی الله لێی بێت ) باوکی پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) ئەو دەعوە و بانگەوازەی ئاشکرا کردووە " بانگەوازی تەوحید " بە بەرائەت و خۆبەریکردن لە شیرک و هاوتا باطل و پووچەکان.

پاشان عیبادەت و بەندایەتی کردنی بۆ الله بە تاک و تەنهایی چەسپاند هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ * إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ * وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ } واتە : وە کاتێ ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت : بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن ★ جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات ★ ئەو ( یەک خـودا پەرستییەی ) لەناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت تا بگەڕێنەوە سەری [ سورەتی الزخرف : 26 ... 28 ـ تەفسیری پوختە ]

واتە : ئەو دەعوە و بانگەوازیەی کە کردی لە بەرائەت و خۆبەریکردن لەو شتانەی کە دەپەرسترێن لە غەیری الله وە بە تاک دانانی الله تعالی لە عیبادەت و بەندایەتی کردن وە بەرائەت و خۆبەریکردن لە هەموو ئەو کەسانەشی کە ئەو شتانە دەپەرستن لە شوێنی الله تعالی جا کارێکی کرد کە ئەو وشەیە ( وشەی تەوحید ) لە پاش

خۆیشی لە نەوەکانییدا هەر بمێنێت ، واتە : ئەو ووشە تەوحیدەی کە دەمێنێتەوە نەفی کردن و إثبات کردن لەخۆی دەگرێت .

وە مەبەست لەمەش ئەوەیە کە هەموو پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) :

- هاوڕا و کۆک بووینە لە دەعوە و بانگەوازی کردندا بۆ تەوحید.

- هاوڕا و کۆک بووینە لە دەعوە و بانگەوازی کردندا بۆ بەندایەتی کردنی الله بە تاک و تەنهایی ، وە بۆ پشتـهەڵکردن و وازهێنان لە هەموو ئەوانەی کە لە شوێنی الله دەپەرسترێت.

- هاوڕا و کۆک بووینە لە دەعوە و بانگەوازی کردندا بۆ عیبادەت و پەرستنی الله ، وە بۆ دوورکەوتنەوە لە پەرستنی طاغوت.

- ( هاوڕا و کۆک بووینە لە بەرائەت و خۆبەریکردندا لە شیرک و لەوانەشی کە شیرک ئەنجام ئەدەن ).

{ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ } واتە : سوێند بە خودا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خـودا بپەرستن و دوورکەونەوە لە ( پەرستنی ) هەر پەرستراوێکی تر.

جا ئەمەش زۆر بەڕوونی بەڵگەیە لەسەر بانگەوازی کردنی ( لا إله إلا الله ) کە ئەویش هەمان بانگەوازیە بۆ دەعوە و بانگەوازی کردن بۆ پەرستنی الله بە تاک و تەنهایی وە بۆ دوورکەوتنەوە لە پەرستنی طاغوت و هەموو پەرستراوەکانی تر.

✅ جا بێگومان شیرک و هاوبەش بڕیاردان پێچەوانە و دژی تەوحیدە ، هەردەم عیبادەت و پەرستنی طاغوتەکان لەخۆی دەگرێتەوە.

✔ وە بێگومان تەوحید و یەک خـودا پەرستی کوفرکردن بە طاغوت و دووخستنەوە لە عیبادەت و پەرستنی طاغوت لەخۆی دەگرێتەوە.

جا هەرکەسێک الله ـی بە تاک دانا وە لە عیبادەت و پەرستنیدا بە تەنها پەرستی ، وە خۆی بەریکرد لە شیرک و ئەهلەکەی و ڕقی لێیان ئەبوویەوە ئەوا ئەوکەسە کوفری کردووە بە طاغوت.

وە هەرکەسێک خۆی بەرینەکرد لە شیرک و ئەهلەکەی و ڕقی لێیان نەئەبوویەوە ئەوا ئەو کەسە شیرکی بڕیارداوە بۆ الله وە کوفری نەکردووە بە طاغوت.

((( الشیخ عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب دەفەرموێت : ولو عرف معنى ( لا إله إلا الله ) لعرف أن من شك أو تردد في كفر من أشرك مع الله غيره ، أنه لم يكفر بالطاغوت [ الدرر السنية ]، واتە : ئەگەر ( مرۆڤی موسلمان ) مانای ( لا إله إلا الله ) ڕوون بوو لەلای ئەوا دەیزانی کە هەرکەسێک گومانی هەبێت یان دوو دڵ بێت لە کوفری ئەو کەسەی کە شیرکی بڕیارداوە چونکە لەگەڵ پەرستنی الله غەیری الله دەپەرستێت ، دەیزانی کە ئەو کەسە کوفری بە طاغوت نەکردووە . )))

## ∮ وانـەی پـەنجـا و سـێ ( 53 ) ∮

وە هەروەها بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت : { لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ }

واتە : بە هیچ جۆرێک زۆر لێ کردن لە دیندا نییە ( بۆ هاتنە ناو ئیسلام ) چونکە بەڕاستی لە یەک جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەر لێ شێواویی ( ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانیان هەیە ) ، ئینجا هەرکەس لە ڕێی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە ( بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرستراوێک جگە لە خـودا ) وە بڕوا بهێنێ بە خـودا ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە دەستەگییرەیەکی قایمی بەهێزی وا ( کە ئیسلام ، یان ئیمانەکەیەتی ) کە پچڕان و بەربوونی بۆ نییە ، وە خـودا بیسەری زانایە [ سورەتی البقرة : 256 ــ تەفسیری پوختە ]

واتە : جا هەرکەسێک کوفر بکات بە طاغوت و بێ باوەڕ بێت بە طاغوت و هەموو پەرستراوێکی بە ناحەق وە ئینجا ئیمان و باوەڕ بهێنێت بە الله ئەوا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە ووشەی تەوحید ، جا ( العروة الوثقى ) بریتییە لە تەوحید ، کە ئەویش ئەو ڕووە بەهێز و قایمەیە کە هەرکەسێک دەستی پێیەوە بگرێت ئەوا دەستی گرتووە بە دینەوە لە ڕوویەکی زۆر بەهێز و قایم وە دەستی گرتووە بەم ئەڵقە قایم و بەهێزەی کە هەڵوەشان و پچڕانی بۆ نییە .

جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر تەحقیق کردن و بەدی هێنانی تەوحید ( العروة الوثقى ) کە ئەویش دوو مەرج لە خۆی دەگرێت ، کە ئەوانیش هەردوو ڕوکنی تەوحیدە :

① کوفرکردن بە طاغوت .

② ئیمان هێنان بە الله .

هەروەها الله سبحانە وتعالی لە کتێبە خۆشەویستەکەی ڕوونی کردووەتەوە کە بەندە درووستکراوەکانی یان ئەو ئەپەرستن وە یاخود طاغوت ئەپەرستن سەرەڕای جیاوازی جۆرەکانی ، جا هەرکەسێک الله سبحانە وتعالی ـی پەرست ئەوا الله بووەتە وەلی و دۆست بۆ ئەو کەسە جا الله هیدایەتی ئەو کەسەی داوە و لە تاریکاییەکان دەریهێناوە بۆ نور و ڕووناکی .

- وە هەرکەسێکیش طاغوتی پەرست ئەوا مستەحەق و شایەنی گومڕایەتیە وە لە نور و ڕووناکی دەرچووە بەرەو تاریکاییەکان .

ئا ئەمەش هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ } واتە : خـودا دۆست و کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێ بڕوایی بۆ ڕووناکی باوەڕ و ڕێنموونیی ، وە ئەوانەی کە بێ بڕوان شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێ لە ڕووناکی (و بیر و باوەڕ ـەوە) بۆ تاریکستان ، ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە.

[ سورەتی البقرة : 257 ـ تەفسیری پوختە ]

جا بەندە درووستکراوەکان دابەش دەبن بۆ دوو بەش : ( ئیمانداران ) ئا ئەوانە الله سبحانە وتعالی یارو یاوەرو دۆستیانە وە دەریان دەهێنێت لە تاریکاییەکان بۆ نور و ڕووناکی باوەڕ.

- وە ( کافرەکان ) طاغوتەکان یارو یاوەر و دۆستیانە کە لە نور و ڕووناکی باوەڕەوە دەریان دەهێنێت بۆ تاریکاییەکانی گومڕایی ، وە ئا ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە طاغوت ئەو شتەیە کە لە جێگای الله تعالی دەپەرسترێت.

- وە الله سبحانە وتعالی لە کتێبەکەیدا ڕوونی کردووەتەوە کە موژدە دان لە قیامەتدا بۆ ئەو کەسە بەدەست دەهێنرێت کە لە پەرستنی طاغوت خۆی بە دوورگرتووە و الله ی بە تاک و تەنهایی پەرستووە ، هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللهِ لَهُمُ الْبُشْرَى فَبَشِّرْ عِبَادِ } واتە : وە کەسانێ کە لە پەرستنی بت ( و هەموو پەرستراوێکی تر ) خۆیان پاراستووە وە گەڕاونەتەوە بۆ لای خـودا مژدەی گەورە تەنیا بۆ ئەوانە کەواتە مژدە بدە بە بەندەکانم.

[ سورەتی الزُّمر : 17 ـ تەفسیری پوختە ]

کەواتە لەگەڵمان بۆت ڕوونبوویەوە گرنگیەتی کوفرکردن بە طاغوت لەگەڵ عیبادەت و بەندایەتی کردنی الله سبحانە وتعالی :-

① جا کوفرکردن بە طاغوت مەرجە بۆ صحەت و درووستیەتی تەحقیق کردنی ووشەی تەوحید :

{ لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا }

واتە : بە هیچ جۆرێک زۆر لێ کردن لە دیندا نییە ( بۆ هاتنە ناو ئیسلام ) چونکە بەڕاستی لە یەک جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەر لێ شێواویی ( ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانیان هەیە ) ، ئینجا هەرکەس لە ڕێی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە ( بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرستراوێک جگە لە خـودا ) وە بڕوا بهێنێ بە خـودا ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە دەستەگییرەیەکی قایمی بەهێزی وا ( کە ئیسلام ، یان ئیمانەکەیەتی ) کە پچڕان و بەربوونی بۆ نییە .

- جا الله سبحانە وتعالی کوفرکردن بە طاغوتی بە مەرج داناوە لەگەڵ ئیمان هێنان بە الله ، بۆ تەحقیق کردنی ( العروة الوثقی ) کە ئەویش شایەتی دانە بە تەوحید .

② وە کوفرکردن بە طاغوت بریتی بووە لە دەعوە و بانگەوازی هەموو پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) لەکاتێکدا سەراپای پێغەمبەران ( سەلامی الله لە هەموویان بێت ) بانگەوازیان دەکرد بۆ عیبادەت و پەرستنی الله بە تاک و تەنهایی وە بۆ دوورکەوتنەوە لە پەرستنی طاغوت ، هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ } واتە : سوێند بە خـودا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خـودا بپەرستن و دوورکەونەوە لە ( پەرستنی ) هەر پەرستراوێکی تر.

③ وە خەڵکی دابەش دەبن بۆ دوو بەش :-

( ئیمانداران ) ئەوانەنە کە الله سبحانه وتعالى یارو یاوەر و دۆستیانە وە لە تاریکاییەکانەوە دەریاندەهێنێت بۆ نور و ڕووناک.

( وە کافرەکان ) ئەوانیش طاغوتەکان لە نور و ڕووناکیەوە دەریاندەهێنن بۆ تاریکاییەکان وە دۆست و یاوەریانن لەسەر کوفرەکانیان.

هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { اللهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آَمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ }

واتە : خـودا دۆست و کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێ بڕوایی بۆ ڕووناکی باوەڕ و ڕێنموونیی ، وە ئەوانەی کە بێ بڕوان شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێ لە ڕووناکی ( و بیر و باوەڕ ـەوە) بۆ تاریکستان ، ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە .

[ سورەتی البقرة : 257 ـ تەفسیری پوختە ]

④ وە موژدە دان ( بە سەرفرازی و سەرکەوتن ) لە قیامەتدا بۆ کەسێک دەست دەکەوێت کە الله ـی بە تاک و تەنها پەرستووە وە خۆی بەدوور گرتووە لە پەرستنی طاغوت، هەروەکو چۆن الله تعالى دەفەرموێت : { وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللهِ لَهُمُ الْبُشْرَى ... }

وە کەسانێ کە لە پەرستنی بت ( و هەموو پەرستراوێکی تر "طاغوت" ) خۆیان پاراستووە و گەڕاونەتەوە بۆ لای خـودا مژدەی گەورە تەنیا بۆ ئەوانە کەواتە مژدە بدە بە بەندەکانم [ سورەتی الزُّمر : 17 ــ تەفسیری پوختە ].

⑤ وە هەروەها بۆیەش خەڵکی لە ولاء و دۆستایەتی و پشتیوانی وە سەرخستن دابەشبووە بۆ دوو بەش :-

- بەشێکیان بە تەنها دینی الله تعالی سەردەخات وە لە پێناوی سەرخستنی ئەم دینە دەجەنگێت.

⊖ وە بەشێکیشیان طاغوت سەردەخات سەرەڕای جیاوازی و جۆرەکانی طاغوت ، وە لە پێناوی ئەو طاغوتە دەجەنگێت .

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : {الَّذِينَ آَمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا}

واتە : ئەوانەی ئیماندارن ( تەنها ) لە پێناوی خـودادا دەجەنگن ( بەڵام ) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و ( طاغوت )ـدا دەجەنگن ، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان ( چونکە ) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە .

[ سورەتی النساء : 76 ــ تەفسیری ئاسان ]

ئەم ئایاتە بەڵگەیە لەسەر ئەمانەی خوارەوە :-

- ئیماندااران ئەوانەنە کە ناجەنگن تەنها لە پێناوی الله تعالی نەبێت :

واتە : سەرخستنی الله سبحانە وتعالی ، واتە : سەرخستنی الله سبحانە وتعالی وە پێغەمبەرەکەی وە دینەکەی .

- جەنگ کردن لە پێناوی طاغوت ـدا لە تایبەتمەندیەکانی کافرانە .
- هەموو طاغوتێک لە حەقیقەتدا شوێنکەوتەی شەیتانە : { فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ}

واتە : دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان.

– جەنگ کردن لە بەرزترینی شێوازی سەرخستن و ولاء و پشتیوانیە ، جا ئیمانداران دۆستایەتی و پشتیوانی لە الله سبحانە وتعالی و پێغەمبەرەکەی و دینەکەی دەکەن ، وە کافرانیش دۆستایەتی و پشتیوانی لە طاغوت و شوێنکەوتوانی دەکەن .

∳ وانـەی پـەنجـا و چـوار ( 54 ) ∳

جا کەواتە لەگەڵمان بۆت ڕوون بوویەوە گرنگیەتی کوفرکردن بە طاغوت ، وە ڕوون بوویەوە کەوا تەحقیق کردنی ئیمان هێنان بە الله نایەتەدی تەنها بە کوفرکردن بە طاغوت نەبێت .

جا ئەی کەواتە طاغوت چییە ؟

⊖ طاغوت :-

وەرگیراوە لە طوغیان کردنەوە ، کەئەویش بریتییە لە سنوور بەزاندن ، وە مەبەستیش لە طاغوت ئەوەیە کەوا بریتییە لە طوغیان کردن و سنوور بەزاندن بەسەر حەق و مافێکی الله سبحانه وتعالى ، یان هەوڵی نیزاع و ناکۆکی بدات لە تایبەتمەندیەک لە تایبەتمەندیەکانی الله تعالى .

- وە بە گەڕان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتە پاکەکان دەتوانین کەوا سەرەکیەکانی طاغوت باس بکەین ، وەک ئەمانەی خوارەوە :-

① " شەیتان " :

چونکە ئەو سەری هەموو طاغوتێکە ، وە ئەو یەکەم کەسێک بوو کە تەکەبوری کرد و خۆی بە زل ڕاگرت لە ئاست فەرمانێکی الله تعالى ، وە پەیمانی بەست بەسەر خۆیدا بە گومڕا کردن و لە خشتە بردنی هەموو مرۆڤەکان .

بۆیە الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت : { أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ } واتە : ئەی نەوەکانی ئادەم ئایا وەسێتم بۆ نەکردن کە شەیتان نەپەرستن چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە .

[ سورەتی یس : 60 ـ تەفسیری پوختە ]

② " طاغوتی حوکام و فەرمانڕەواکان " : ئەوانەی کەوا حوکم دەکەن بە غەیری شەرعی الله سبحانه وتعالی.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالاً بَعِيدًا}

واتە : ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ ( کە قورئانە ) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە ( کە تەوراتە ) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خودا ناکات لەکاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لە ڕاستی .

[ سورەتی النساء : 60 ـ تەفسیری پوختە ]

- جا ئەو وتەیەی الله سبحانه وتعالى کە فەرمووی : {يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ} واتە : دەیانەوێت کە حوکم و دادوەری بگەڕێننەوە بۆلای طاغوت.

- بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لێرەدا مەبەست لە طاغوت بریتییە لەو کەسەی کە حوکم و دادوەری بۆلای دەگەڕێنرێتەوە لە غەیری الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) .

وە هەروەها تەئکید و دووپاتی کردەوە ئەوەی کە لە فەرموودەکەدا هاتووە : لە أبي شريح ـەوە، کە أبو شريح نازناوی ( أبا الحكم ) بوو ، پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) پێی فەرموو : « إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ » واتە : بەڕاستی الله خۆی دادوەرە ، وە حوکمیش هەر بۆ ئەوە.

جا هەرکەسێک ناکۆکی بکات لەگەڵ الله لە حوکمیدا ئەوا ئەو کەسە طاغوتە .

③ " طاغوتی زانایان " :

ئەوانەی کە حەڕام حەڵاڵ دەکەن یان حەڵاڵ حەڕام دەکەن لەکاتێکیشدا دەزانن ، لەبەرئەوەی ئەو جۆرە زانایانە بەم کارە نیزاع و ناکۆکی دەکەن لەگەڵ الله سبحانه وتعالی لە ئاست حەقی حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن .

وە ووتەکەی الله سبحانه وتعالی ڕوونی دەکاتەوە لەبارەی یەهود و گاوڕەکان کە دەفەرموێت : {اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا} واتە : ( گاور و جوو ) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خـودا ( ملکەچ و فەرمانبەرداریانن ، ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن ) هەروەها مەسیحی کوڕی

مەریەمیش ( بە کوڕی خـودا دەزانن ) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خـودایەک. [ سورەتی التوبة : 31 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە لە پێشوودا باسمان کرد کە عەدی کوڕی حاتەم کاتێک گوێی لە پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم) کە ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە ، جا ئەویش بە پێغەمبەری گوت (صلی الله علیه وسلم) : " إِنَّا لَسْنَا نَعْبُدُهُمْ " واتە : ئێمە ئەوانمان نەئەپەرست.

پێغەمبەری خـوداش ( صلی الله علیه وسلم ) پێی فەرموو : « أَلَيْسَ يُحَرِّمُونَ مَا أَحَلَّ اللهُ فَتُحَرِّمُونُهُ ، ويُحِلُّونَ مَا حَرَّمَ اللهُ فَتَسْتَحِلُّونَهُ ؟» قال عدي : بلى ، فقال النبي ( صلى الله عليه وسلم ) : « فَتِلْكَ عِبَادَتُهُمْ » واتە : ئایا ئەو شتەی کە الله حەڵاڵی کردبوو ئەوان حەڕامیان نەدەکرد جا ئێوەش بە حەڕامتان ئەزانی ، وە ئەو شتەی الله حەڕامی کردبوو ئەوان حەڵاڵیان نەدەکرد ئێوەش بە حەڵاڵتان ئەزانی ؟ عەدی ـش گوتی : بەڵێ ، جا پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : " ئا ئەوە بەندایەتی کردن و گوێڕایەڵی کردن و پەرستنیانە " .

- جا لێرەدا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) تەفسیری کرد کە یەهود و گاوڕەکان زاناکان و عابیدەکان دەکەن بە پەروەردگاری خۆیان لە شوێنی الله.

– ماناکەی ئەوەیە کە ئەوان شوێنیان دەکەون لە حەڵاڵ کردنی حەڕام ، وە حەڕام کردنی حەڵاڵ .

- وە بێگومان الله سبحانە وتعالی ناوی نا لە زانا و عابیدەکان بە خودا ، لەبەرئەوەی ئەوان نیزاع و ناکۆکی دەکەن لەگەڵ الله سبحانە وتعالی لە ئاست حەقی حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن .

- وە ئەمە کاهینەکانیش دەگرێتەوە ئەوانەی کە حوکم و دادوەری لەنێوانی خەڵکی دەکەن بە هەواو ئارەزووەکانی خۆیان و مەجلیسەکان عورفی ( داب و نەریت ) یان مەجلیسەکانی دەشتەکی کە ئەوەی حوکمی پێ دەکرێت لە غەیری شەرعە.

- یان ئەنجومەنی نوێنەران کە دەستەڵاتی یاسادانان و حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن ئەدەن بە خۆیان وە ناویشیان ناوە ( دەستەڵاتی یاسا دانان ).

▪ وە حوکمەکانی ( ئەوەی لەم ئەنجومەنەوە دەردەچێت ) بە پێویست دادەنێن ، وە سزای ئەو کەسە دەدەن کە پێچەوانەی دەکات ، وە صیفەتی بە گەورە دانان و بە پیرۆز دانان ئەدەن بەسەر ئەم یاسایانەوە .

④ " طاغوتی کاهینەکان ( جادووگەر و قەشەکان ) :-

ئەوانەی کە بانگەشەی زانینی غەیب دەکەن ، لەکاتێکدا بێگومان زانینی غەیب کارێکە کە تەنها تایبەتە بە الله سبحانە وتعالی ، هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت: {قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ الغَيْبَ إِلَّا اللهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ} واتە : بڵێ کەسانێ کە لە ئاسمانەکان و زەوی دان غەیب نازانن بێجگە لە خودا (تەنها ئەو دەیزانێ)، و ئەوان هەست ناکەن چ کاتێ زیندوو دەکرێنەوە .

[ سورەتی النمل : 65 ــ تەفسیری پوختە ]

وە هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : { قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ ... } واتە : ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) بڵێ : من خاوەنی هیچ سوود و زیانێك نیم بۆ خۆم مەگەر ئەوەی خـودا بیەوێ ، ئەگەر من نادیارەکانم بزانیایە خێرو خۆشی زۆرم بەدەست دەهێنا وە هیچ خراپە و زیانێکم پێ نەدەگەیی.

[ سورەتی الأعراف : 188 ــ تەفسیری پوختە ]

وە لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خـودا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت :

« مَنْ أَتَى عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا يُؤْمِنُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) »

واتە : هەرکەسێک بچێتە لای شوێن هەڵگرێک ( بۆ پرسیارکردنی شتێکی بزر بووی ) یان بچێتە لای کاهینێک ( جادووگەرێک ، بۆ نوشتەیەکی سحر ) ، ئینجا باوەڕ بکات بەو قسانەی کە دەیڵێت ، ئەوا بێگومان کافر و بێباوەڕ بووە بەو قورئانەی کە بۆ سەر محمد ( صلى الله عليه وسلم ) دابەزیوە .

لەبەرئەوەی بەهۆی ئەمەوە کەسێکی بەڕاست داناوە لە کارێکدا کە هیچ کەس نایزانێت تەنها الله سبحانە وتعالی نەبێت ، جا جادووگەرەکان یان فاڵچی و شوێن هەڵگرەکان نیزاع و ناکۆکی دەکەن لەگەڵ الله سبحانە وتعالی لە تایبەتمەندیەک لە تایبەتمەندیەکانی الله تعالی .

⑤ " طاغوتی هەواو ئارەزوو " :

لەکاتێکدا الله سبحانە وتعالی لە کتێبە خۆشەویستەکەی ناوی خودا و پەرستراوی لە هەواو ئارەزوو ناوە ، هەروەکو چۆن الله عز وجل دەفەرموێت : { أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً }

واتە : ئایا نابینیت ئەو کەسەی کە ئارەزووی خۆی کردۆتە خودای خۆی ( شوێن نەفسی بەدکردار کەوتووە ) ئایا تۆ دەتوانیت ئەوانە بپارێزیت لە لادان و سەرکەشی ؟! ( یاخود سنوورێکیان بۆ دابنێیت ؟ خەمت نەبێ بۆ کوێ دەچن ؟).

[ سورەتی الفرقان : 43 ــ تەفسیری ئاسان ]

وە الله تعالی دەفەرموێت : { أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَنْ يَهْدِيهِ مِنْ بَعْدِ اللهِ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ }

واتە : ئاخۆ بینیوتە ئەو کەسەی هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی خـوداش بە زانایی گومڕای کرد ، وە مۆری ناوە بەسەر گوێ و دڵیدا وە پەردەی داوە بەسەر چاوی دا ، دەی جگە لە خـودا کێ ڕێنموونیی دەکات دەی بۆچی بیر ناکەنەوە .

[ سورەتی الجاثیة : 23 ــ تەفسیری پوختە ]

– جا لێرەدا الله سبحانە وتعالی ناوی خودا و پەرستراوی لە هەواو ئارەزوو ناوە ، وە یەکێک لە سەلەف دەفەرموێت :

( ما تحت أديم السماء إلهٌ يُعبد من دون الله أعظم من هوى مُتَّبع ) واتە : لە ژێر تاقی ئاسماندا پەرستراوێکی گەورەتر نییە کە لە شوێنی الله بپەرسترێت گەورەتر بێت لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو .

∮ وانـەی پـەنجـا و پـێـنــج ( 55 ) ∮

جا ئەگەر گوترا : شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو هەموو شوێنکەوتنێکی هەواو ئارەزوو دەگرێتەوە لە پێچەوانە کردنی دینی الله ، یەکسانە سەرپێچی کردن بێت یاخود کوفر بێت.

جا چۆن بڵێین : ئایا فوڵان کەس هەواو ئارەزووی خۆی دەپەرستێت یان بڵێین شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی دەکەوێت ؟

وە ئایا هەموو شوێنکەوتنێکی هەواو ئارەزوو بەندە کافر دەکات ؟

وەڵام :-

جیاوازی هەیە لەنێوان شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو لە هەندێک شتی تایبەتدا لە ئەنجامدانی سەرپێچی و گوناهە گەورەکان ، جا ئەو شوێنکەوتنە تاوان و فاسق بوونە.

- وە لەنێوان شوێنکەوتنی موتڵەقی هەواو ئارەزوو بەبێ قەید و مەرج یان شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو لە کوفردا ، یان شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو لەو شتەی دژە لەگەڵ شەرع ، بەو شێوەیەی کە بەندە ببێتە شوێنکەوتەی هەواو ئارەزوو نەوەک شوێنکەوتەی فەرمانی الله سبحانه وتعالی .

وەک لەم نموونە بسیط ـانە بۆت ڕوون دەکەینەوە بواری خەڵک لە پەرستنی هەواو ئارەزوویان :-

▪ جا لەنێو خەڵکیدا کەسانێک هەنە کە چەندین دینی نوێیان داهێناوە بە هەواو ئارەزووی خۆیان وە پێشی ئەخەن بەسەر دینی اللە :

وەک دینی شیوعی و وجودی و دیموکراسی و لیبڕالی ، وە جگە لەمانەش.

▪ وە لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی تر هەنە کە شوێنی هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون چونکە حەڕام حەڵاڵ دەکەن وە حەڵاڵ حەڕام دەکەن بە هەواو ئارەزووی خۆیان بەبێ هیچ بەڵگەیەک ، وەک ئەو کەسانەی کە زینا و ئارەق بە حەڵاڵ دادەنێن لەژێر ناوی هونەر و کاری درامایی و هاوشێوەی ئەمانە .

▪ وە لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی تر هەنە گاڵتە و سوکایەتی بە دین دەکەن لە ژێر ناوی ئازادی و لیبڕالی.

▪ وە لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی تر هەنە ڕەخنە لە دینی اللە دەگرن یان ڕەخنە لە هەندێکی دین دەگرن بە بیانووی ئەوەی کە بەرهەڵستی عەقڵیان دەکات ، وە عەقڵیان ئەم حوکمی شەرعە بە چاک دانانێت ، وە ئەمەش وەک ئەو کەسانەیە کە ڕەفزی حیجاب دەکەنەوە یان ڕەفزی حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلامی دەکەنەوە یان ڕەفزی حەددە شەرعیەکان دەکەنەوە یان ڕەفزی فرە ژنی دەکەنەوە " هەتا ئەگەر بە مەرجی عەدل و دادگەریش بێت " یان غەیری ئەمانەش.

⛔ جا ئەو جۆرە کەسانە ( ئەم کارانە دەکەن ) بە بیانووی ئەوەی کە عەقڵیان قبوڵی ئەو حوکمانە ناکات یان قبوڵی هەندێکی ناکات ، جا سەرچاوە و مەرجەعیەتی بەرز لەلای خۆیان دادەنێن نەوەک لەلای شەرعی اللە و بەڵگەی شەرعی دابنێن.

وە بێگومان ئەمەش لەبەر هەواو ئارەزووی خۆیانە لەمە زیاتر نییە:

▪ وە لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی تر هەنە نیشتیمان پێش دەخەن بەسەر دیندا ، یان بانگەشە دەکەن بۆ یەکگرتنی ئاینەکان ، وە وا دادەنێن کە ئەو دینە گۆڕدراوانە یەکسانە لەگەڵ ئیسلام وە هەموو باوەڕ و ڕێبازەکان کۆتاییەکەی بۆلای الله ـیە .

▪ وە لەنێو خەڵکیدا کەسانێکی تر هەنە بانگەشە دەکەن بۆ شیکاری کردن لە دینەکان وە وا دادەنێن کە تەصەوف یان یوجا یان داهێنانەکانی عەقڵی دەکرێت بەجێهێنانی لە دەرئەنجامی دین بێت وە تحقیقی هەمان ناوەڕۆکیەتی.

- ئەو نموونانە هۆکارەکەی تەنها لەبەر پەرستنی هەواو ئارەزووە ، وە پێشخستنیەتی بەسەر شەرعی الله و حوکمی الله سبحانە وتعالی.

– بەڵکو بەندەی هەواو ئارەزوو ئەوانە کارو پیشەیان تەنها لێ دارمان و کەمکردنەوەی دینی الله سبحانە وتعالی ـیە یان بە چاک دانانی بەرنامەکانی تری غەیری ئیسلامە .

- هەموو ئەو نموونانە مرۆڤ کافر دەکات هەروەکو چۆن بینیت ، دەسوڕێتەوە بە دەوری قبوڵ نەکردنی شەرعی الله سبحانە وتعالی یان تۆمەت بار کردنی بە کەم و کورتی یان دوا کەوتوویی یان بە چاک دانانی غەیری شەرعەکەی الله سبحانە وتعالی ، یان پەرستنی الله بەو شێوەیەی کە الله تعالی داوای نەکردووە و نەیکردووە بە شەرع.

وە زۆربەی جاریش ئەو کارانە دەکرێت لە ژێر ناو و درووشمی ڕازاوە ، وەک :

( ڕۆشن کردنەوەی ئیسلام ، وە بەرهەڵستی کردنی دواکەوتوویی دینی ، وە نویێ کردنەوەی ووتاری دینی ، وە وەکو ئیسلامی پێشکەوتوویی ... ) وە هاوشێوەی ئەمانە، وە بەڕاستی هەندێک لە ئەهلی عیلم پێناسەی طاغوتیان کردووە بەوەی کە :

(هەرکەسێک بپەرسترێت لە شوێنی الله وە ئەویش پێی ڕازی بێت).

## ∮ وانـەی پـەنجـا و شـەش ( 56 ) ـ کـۆتایـی ∮

له کۆتاییدا باسی پێناسەیەکی پێشەوا إبن القیم دەکەین ( رەحمەتی الله لێی بێت ) لەبارەی طاغوتەوە کە دەفەرموێت :

" الطَّاغُوتُ : كُلُّ مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْعَبْدُ حَدَّهُ مِنْ مَعْبُودٍ أَوْ مَتْبُوعٍ أَوْ مُطَاعٍ ؛ فَطَاغُوتُ كُلِّ قَوْمٍ مِنْ يَتَحَاكَمُونَ إِلَيْهِ غَيْرَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ أَوْ يَعْبُدُونَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ ، أَوْ يَتْبَعُونَهُ عَلَى غَيْرِ بَصِيرَةٍ مِنْ اللَّهِ ، أَوْ يُطِيعُونَهُ فِيمَا لَا يَعْلَمُونَ أَنَّهُ طَاعَةٌ لِلَّهِ ، فَهَذِهِ طَوَاغِيتُ الْعَالَمِ إِذَا تَأَمَّلْتَهَا وَتَأَمَّلْتَ أَحْوَالَ النَّاسِ مَعَهَا رَأَيْت أَكْثَرَهُمْ مِنْ عِبَادَةِ اللَّهِ إِلَى عِبَادَةِ الطَّاغُوتِ ، وَعَنْ التَّحَاكُمِ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى الرَّسُولِ إِلَى التَّحَاكُمِ إِلَى الطَّاغُوتِ ، وَعَنْ طَاعَتِهِ وَمُتَابَعَةِ رَسُولِهِ إِلَى طَاعَةِ الطَّاغُوتِ وَمُتَابَعَتِهِ " .

واتە : طاغوت : هەرشتێک بەندە بەهۆیەوە سنووری بەندایەتی ببەزێنێت لە پەرستن یان لە شوێنکەوتن یان لە گوێڕایەڵی کردن ، جا طاغوتی هەموو گەلێک ئەوانەنە کە حوکم و دادوەریان بۆلا دەگەڕێنرێتەوە لە غەیری الله و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) یان دەپەرسترێن لە شوێنی الله تعالى ، یان شوێنیان دەکەون بەبێ ئەوەی کە هیچ بەرچاو ڕوونیەک و بەڵگەیەک هەبێت لەلایەن الله عز وجل ـەوە ، یان گوێڕایەڵیان ئەکەن لە شتێکدا و نازانن ئەو گوێڕایەڵی کردنە تایبەتە و تەنها دەبێ بۆ الله بێت ، جا ئائەمانە طاغوتەکانی جیهانن ، ئەگەر سەرنجی بدەیت و بیری لێ بکەیتەوە حاڵی خەڵکی چۆنە لەگەڵ طاغوتان دەبینیت زۆربەی خەڵکی وازیان هێناوە لە بەندایەتی الله بەرەو بەندایەتی طاغوت چوونە ، لە گەڕانەوە بۆ حوکمی الله و

پێغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) حوکم دەگەڕێننەوە بۆلای طاغوت ، وە لە گوێڕایەڵی کردنی الله و شوێن کەوتنی پێغەمبەرەکەی ( صلى الله علیه وسلم ) چوونە بەرەو گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی طاغوت .

وە لەکاتێکدا بینیمان ئەم ووتەیەی الله تعالى کە دەفەرموێت : { اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ }

واتە : خـودا پشت و پەنا و خاوەنی ئەو کەسانەیە باوەڕیان هێناوە ، لە تاریکاییەکانی ( گومان و ستەم ) دەریان دەهێنێت و دەیانبات بەرەو نوور و ڕووناکی ، ئەوانەش کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر ، یارمەتی دەرەکانیان تەنها ـ طاغوتەکانە ـ لە نوور و ڕووناکی دەریان دەهێنن و بەرەو تاریکاییەکان دەیانبەن ، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە [سورەتی البقرة : 257 ـ تەفسیری ئاسان].

جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عیبادەت و پەرستنی طاغوت یان شوێنکەوتنی طاغوت یان گوێڕایەڵی کردنی طاغوت مرۆڤ لە ئاینی ئیسلام دەردەکات ، وە لەم مانایەش دڵنیادەبینەوە کە لە فەرموودەدا هاتووە لە پێغەمبەری خـوداوە ( صلى الله علیه وسلم ) کە دەفەرموێت :

« ... يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ : مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْهُ ، فَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ الْقَمَرَ ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ الطَّوَاغِيتَ ... » واتە : الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی کۆدەکاتەوە ، ئینجا دەفەرموێت : هەرکەسێک شتێکی پەرستووە ئەوا با شوێنی بکەوێت ، جا هەرکەسێک ڕۆژی پەرستووە شوێنی ڕۆژ دەکەوێت ، وە هەرکەسێک مانگی پەرستووە شوێنی مانگ دەکەوێت ، وە هەرکەسێک طاغوتەکانی پەرستووە شوێنی طاغوتەکان دەکەوێت.

- جا ئا ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێک طاغوتان بپەرستێت ئەوا ئەو کەسە شوێنی ئەو طاغوتانە دەکەوێت بۆ ناو ئاگری جەهەننەم " والعياذ بالله تعالى " .

وە بێگومان لەگەڵمان بۆت ڕوون بوویەوە کە عیبادەت و پەرستنی طاغوت ئەمانە دەگرێتەوە :-

❄ ئاراستە کردن و ئەنجامدانی عیبادەت و بەندایەتی بۆ طاغوت لە شوێنی الله .

❄ یان شوێنکەوتنی طاغوت لە حوکمەکەیدا کە پێچەوانە و دژە لەگەڵ شەرع .

❄ یان گوێڕایەڵی کردنی لە غەیری ئەوەی الله کردوویەتی بە شەرع .

ئەمە کورتەیەک بوو لە پەیوەندی کوفرکردن بە طاغوت ـەوە " وەک مەرجێک بۆ تەحقیق کردن و هێنانەدی تەوحید "

لەگەڵ ئیمان هێنان بە الله تعالى و گوێڕایەڵی کردنی ، وە بە تاک دانانی الله لە عیبادەت و پەرستنیدا .

داوا لە الله تعالى دەکەین کەوا لەو کەسانە بین کە دووردەکەونەوە و خۆیان دوورە پەرێز دەکەن لە عیبادەت و پەرستنی طاغوت ، وە ئیمان دەهێنن بە تاک و تەنهایی الله سبحانە وتعالى، آمین.

---

بە فەزڵی الله تعالى کۆتاییمان هێنا بە زنجیرە وانەکانی (چۆن دەبیتە کەسێکی موەحید).

اللهم علمنا ما ینفعنا وانفعنا بما علمتنا وزدنا علما ، ونسأل الله ان یقبل عملنا خالصاً لوجهه وان یتقبل منکم وکل من تابع وساهم في نشرها ، وصلى الله على سیدنا محمد واله وصحبه وسلم والحمد لله رب العالمین .